کۆماری عێراق
وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن
…گای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە (97)

# دیوانی سەفوەت

دیوانی
مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسووڵی
دیلیژە

پێشەکی و
ئامادەکردن و پەراوێز بۆنووسینی
دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوڵ
پرۆفیسۆر

چەندە پێم خۆشە بە کوردی دەنگی خاڵەی ڕێبوار
ڕێبوارە ئەهلی دنیا هەرچی هات و هەرچی چوو



# دیوانی سەفوەت

## مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسووڵی دێلێژە

## ١٩٠٥ ـ ١٩٦٣

ئامادەکردن و پێشەکی و پەراوێز بۆ نووسینی

پرۆفیسۆر دوکتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ

بەغدا ـ ١٩٨٤

# پێشـــــەکی

کە ساڵی ١٩٦٩ دەستم دایـە چاپی دیوانی ( ن. ئاری ) ، لام‌وابوو ناگونجێ برازا پێشەکی بۆ دیوانی مامێکی کۆچکردووی بنووسێ ، چونکە لەوانەیە تەوژمی عاتیفە ڕێگە لە بڕیاری ڕاست‌و مەوزووعی بگرێ ، لەبـەر ئەوە ڕێگەی لەسەر نووسین‌و بڕیاردانم بۆ برا نووسەرەکانم چۆڵکـرد . بەڵام وا بۆ چواردە ساڵ دەچێت ئەو دیوانە دەرچووە ، نە باسی دیوانەکەو نـە باسی ئـەو شـــاعیرە نیشـتمانپەروەرە فیداکارە لـە هیچ شـــوێنێك نەکراوە[1] . لەبەر ئەوە ، ئەگەر فریای چاپێکی تری دیوانەکەو بەرهەمـە چاپکراوەکانی نەکەوم ، ڕەنگە زۆر لە شـــوێنەواری ژیانی ( ن . ئاری ) وون‌ببێت .

ئەم ڕاستیبەم ، لە کاتی ئامادەکردنی دیوانی ( سەفوەت )دا دەهاتەوە بەرچاو • دەمویست کەسێکیتر پێشەکیی • بۆ بنووسێ ، بەڵام ئەوەش دەبوو بە کارێکی زۆر دەستکرد • هەرچی ئەو دوو نووسینەی مامۆستا عەلادین سەجادیو مامۆستا سەعید ناکامیشە کە لەگەڵ ئەم دیوانەدا دەیانبینن ، ئەوە دوو ووشەی وەفاداریو دوو یادگاری بە نرخی نیشتمانپەروەرین • بەڵام جێی پێشەکییەکە ناگرنەوە • لەبەر ئەوە لە نێو دوو جەمسەری تەوژمی عاتیفەو ووتەی مەوزووعیدا خۆم لەم ناوەڕاستو هاتو بردەدا دییەوەو دەستم دایە نووسینی ئەم پێشەکییەو هیوام وایە لێرەدا هەر لە ناوەڕاستدا بمەو تەجروبەکەش سەرکەوتوو بێت •

« سەفوەت » مەلا مستەفای کوڕی حاجی مەلا ڕەسوولی دێلێژەیە سالی ١٣٢٤ی هیجری ١٩٠٦/١٩٠٧ی میلادی لە گەڕەکی دەرگەزێن ، لە شاری سلێمانی لە دایك بووە • باوکی لە گوندی دێلێژەی قەرەداغەوە هاتۆتە سلێمانیو لەو مزگەوتەی بە ناوی مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسوولەوە بەناوبانگ بوو ئیمامو مودەڕیس بووەو بە پێی هاوپێوەندیی لەگەڵ کاك ئەحمەدی شێخدا کە لە نزیك بوونەوەی مەرگی خۆیدا کردوویەتی بە خەلیفەی خۆی ، بووە بە واعیزی سلێمانیو ئێواران لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی وەعزی داداوە •

حاجی مەلا ڕەسوول کوڕی مەلا محەمەدی مەلا شەریفە • لەوە دەچێت پێوەندیی تەواو و ڕاستەقینەی ئەو بنەماڵەیە لەگەڵ مەلایەتیدا لە حاجی مەلا ڕەسولەوە دەستی پێکردبێ • چونکە زوربەی خزمەکانی بە فەلاحەتەوە خەریكبوون • هەرچەندە باوكو باپیری خوێندەواریيان بووەو مەلا حسێنی برای خوێندەوار بووەو هەندێ شیعرشی هەیە • ئەمە بێجگە لە پێوەندیی خزمایەتیی لەگەڵ هەموو خەڵکی دێلێژەدا ، بە شێخو مەلاو فەلاحەوە ، کە تا ئێستاش هەموو هەر خزمن •

« سەفوەت » ؛ لە دایکەوە کوڕی ڕەعنای شێخ عەزیزی شێخ فەتاحی خانەقایە کە برازاو جێ‌نشینی مەولانا خالیدی مکایلی‌ی نەقشبەندی بووە . نەنکی ( لە دایکەوە ) ، لە ئاغاکانی شیوەکەڵە . ئەم پێوەندیی خزمایەتی‌یانە هەموو کاریان لە پێگەیاندنو ژیانی شاعیردا بووەو کاریان تێ‌کردووەو لە ژیانی خۆیدا پێوەندی‌یەکی بە تینو فرەوانی خزمایەتیی لەگەڵ هەموو ئەم جەمسەرانەدا بووە .

« سەفوەت » چوار برای بووە ، سیانیان لە خۆی گەورەتر ، مەلا ئەحمەد ( فائیز ) ؛ مەلا محەمەد ( فەیزی ) ، مەلا مەحموود . یەکێکیان لە خۆی بچووکتر ؛ نەجمەدین ( ن . ئاری ) . تاقە خوشکێکیشی بووە ( حەپسە خان ) ؛ کە خێزانی شێخ عارفی دێلێژە بووە .

هەروەك حاجی مەلا ڕەسووڵ شاعیر بووەو دیوانی شیعری بە ناوی ( موخلیس )دوە هەیە[2] ؛ هەروەها مەلا ئەحمەد[3]و مەلا محەمەد[4]و نەجمەدینیش شاعیر بوون . هەرچی مەلا مەحموودە ، ئەگەر شیعریشی نەبێ ، ئەوا هەموو ئەوانەی دەیانناسی دەزانن کە لە مەیدانی ئەدەبیاتناسی‌و شیعر زانی‌و شیعر لەبەری‌و زۆر مەیدانی‌تری شارەزاییدا یەکێك‌بوو لە بلیمەتەکانی چەرخی خۆی[5] .

شاعیر وەك هاو تەمەنانو هاوچەرخانی خۆی‌و وەك کوڕە مەلایەکی خەڵکی سلێمانی لە منالیدا چۆتە حوجرە ، سەرەتا لە لای مەلا فاتم[6] لە گەڕەکی خۆیان خوێندوویەتی . پاشان چۆتە حوجرە بەناوبانگەکەی خواجە ئەفەندی‌و لەسەر پێڕەوی ئەو چەرخە حوجرەی تەواو کردووە ، پاش ئەوە لە مزگەوتەکەی خۆیان[7] خوێندوویەتی ، پاشان بۆ فێربوونو جیهانبینی بە هاندانی باوکی کەوتۆتە گەڕان .

« سەفوەت » لە ژیانی فەقیەتیدا زۆر شوێن گەڕاوە . ماوەیەك لای مەلا ئەحمەدی نورقانی ڕۆژبەیانی خوێندوویەتی . خۆی دەیگێڕایەوە

دەبووت : من سوختە بووم ، لەسەر دەستووری مزگەوت‌و ناو مەلایان دەبوو موستەعید دەرسم پێ‌بلێت ، بەڵام کە مامۆستا مەلا ئەحمەد ناسیمی ئیتر خۆی دەرسی پێ‌دەوتم . بەم جۆرە هەر لەو پلەی خوێندنەمدا بەرەکەتم لە زانینی ئەو مامۆستا زاناو بلیمەتە وەرگرت[٨] .

ماوەیەك لە کەرکووك لە مزگەوتی منارە نەخشین کە بە ( مزگەوتی فەرهاد )یش ناسراوە لای مەلا ڕەزای واعیز خوێندوویەتی . هەر بە فەقێیەتی چۆتە گوندی « بێژوێ »ی لای سەردەشت‌و لای حاجی مەلا سەعید خوێندوویەتی . لە یادگاری ( بێژوێ )دا و لە ناو پیاوانی مەزندا هەمیشە باسی « شێخ ئەمین »ی بێژوێنی دەکردو زۆری خۆش دەویست . شێخ ئەمین زۆر کاری تێ‌کردبوو ، دیارە دەبێ ئەویش دەرسی پێ ووتبێ .

پاش ئەم گەشتی فەقێیەتی‌یە هاتۆتەوە سلێمانی‌و لای مەلا حسێنی پیسکەندی خوێندوویەتی‌و پاشان لە خانەقای مەولانا لای شێخ عومەری قەرەداغی ( ئیبنولقەرەداغی ) هاو خوێندنی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس‌و مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ بووە . دووا پلەی خوێندنی لە مزگەوتی شێخ عەبدوڕەحمانی شێخ ئەبووبەکر بووە لە سلێمانی ( کە لەناو خەڵکدا بە مزگەوتی بابەعەلی بەناوبانگە ) . هەر لەوێ ئیجازەی عیلمی‌ی لای شێخ بابە عەلی‌ی شێخ عەبدوڵڵای تەکیەیی ( ١٨٨٥ - ١٩٤٠ ) وەرگرتووە . بەڵام هەر بۆ پیرۆزی دوو ئیجازەی مۆرکراوی شێخ عومەرو مەلا ڕەزای واعیزیشی وەرگرتووە . کە نرخی ئیجازەکەی مەلا ڕەزا لەلای خۆی لەوەدا بوو کە سەنەدەکەی یەکسەر دەچێتەوە سەر موفتیی زەهاوی .

کە باوکی کۆچی دوایی کردووە ، لە سەرەتادا مەلا مەحموودی برای لەجێی دانراوە . بەڵام مەلا مەحموود هەر لە ژیانی باوکیدا کە خوێندنی مەلایەتیی بەرەو تەواوبوون چووە ، ڕووی کردۆتە کاسبی‌و ئەو سەردەمە حاڵی باش بووە . لەبەر ئەوە هەر نزیکەی ساڵێك مەلایەتیی کردووەو دوایی

بە ڕەزامەندیو پەسندیی خۆی مزگەوتەکەی بۆ مەلا مستەفای برای بەجێهێشتووەو ئەوی خستۆتە جێی خۆی • بەم جۆرە لە ۱۹۲۸دا بە ئیرادەی مەلیکی بووە بە مودەریسی مزگەوتەکەی باوکیو پێشنوێژیشی هەر لەوێ کردووەو تا کۆتایی ژیانی مودەریسو پێشنوێژی ئەو مزگەوتە بووە • بەڵام کە لە سالی ۱۹۵٦دا لەپاڵ مزگەوتی گەورەی سلێمانیدا خانەقای مەولاناش بوو بە شوێن نوێژی جومعە ، لەبەر تواناو بە خەتیبی ناسراویو لەبەر ئەوەی خانەقا شوێنی باپیری بووەو دوو باپیری لە دایکیەوە ( شێخ عەزیزو شێخ فەتتاح ) لەوێدا نێژراون ، کرا بە خوتبەخوێنی خانەقاش •

گوزەرانی « سەفوەت » لە هەموو ژیانیدا هەر بە مەلایەتی بوو ، زۆری لە خۆی دەکرد کە بە مووچەی کەمی مەلایەتی بژیو دەست بۆ خەلك پان نەکاتەوە • لە کاری مەلایەتیدا زۆر ڕقی لەوە بوو کە مەلای کەم مووچە یا بێمووچەی ئەو سەردەمە بە ناچاری پەنا بەرێتە بەر ( زەکاتو سەرفترەو پارەی مارەبڕینو تەلاق چاككردنەوە ) ، بە تایبەتی ئەمەی دووایانی بە کارێکی ناپەسندو حەرام دەزانی ، هەمیشە دەیووت : ئەگەر تەلاق کەوتبێ ئەوە بە مەلا چاك ناکرێتەوە ، ئەگەر نەشکەوتبێ ئەوا مەلای ناوێت • هەر ئەم هەستە وای لێکرد کە لە ساڵانی جەنگی دووەمی جیهاندا کە گرانی پێی لێهەڵپڕیبوو ، بەدەم مەلایەتیەوە بکەوێتە کاسبی • لێرەدا دوو دۆستی دێرینی بە ناوی پشتگیریو یارمەتیەوە مولکی خۆیان بە شێوەی ئیجارەکردن دایە • حسێن بەگی حەسەن بەگی محەمەد پاشای جاف « بێستان سوور »ی شارەزووری دایەو پاش ئەو مەحموود نەهمیی نەقی محەمەدی هەمەوەندیش « گۆپالە »ی لای بازیانی دایە • ئیتر کەوتە هاتوچۆ بۆ سەرپەرشتیی کشتوکاڵ ، بەڵام ئەمە کاری ئەو نەبوو ، تەواو ماندووی کردو هەر لەو سەردەمەداو بەو هۆیەوە تووشی سیل بوو •

که نەخۆشی تەواو نارەحەتی‌کرد ماوەیەك لە نەخۆشخانەی «عەزل»ی بەغدا کەوت . لە سەرەتای ۱۹٤۳دا بە یارمەتیی تۆفیق وەهبی بەگ کە ئەو کاتە وەزیری کاروباری کۆمەلایەتی بوو و ئیشی نەخۆش‌و نەخۆشخانە سەربەو وەزارەتە بوو . نێررایە سەنەتۆریۆم ( مەسەح )ی بەحەنەس لە لوبنان . کە ئەوسا حکوومەتی عیراق نزیکی سەد جێگەیەکی بۆ نەخۆشی عیراقی تێدا بەکرێ گرتبوو . نزیکەی سالێك لە لوبنان مایەوە . ئەم سالە بۆ مال‌و مندالی ناخۆشترین‌و سەخترین سالی ژیان بوو و تائێستاش شوێن پەنجەی لە دەروون‌و بیرو یادگاری هەموماندا ماوە . دیارە بۆ «سەفوەت» خۆیشی سالی لە نیشتمان دووری‌و ناخۆشی‌و نەخۆشی بوو . تارمایی مەرگی چەند جار لێوەنزیك بۆوە . بەلام هەر لەو کاتەشدا بۆ کەسێکی وەك ئەو کە بە زیرەکی ناسرابوو . سالی سوودبینینێکی گەورە بوو . ئەگەر لە سەرەتادا شتێك لە بابەتی هاوچەرخێتی لە مەلای‌تری جیا کردبێتەوە ، ئەوا ئەم سالە ئەو شەقلەی لە دیمەن‌و جل‌وبەرگ‌و بیرو جیهانبینینی ئەودا چەسپاند .

لە نەخۆشخانەدا ، هەر لە ناو نەخۆشە عیراقی‌یەکاندا ، کۆمەلی دۆستی رۆشنبیری پەیداکرد[٩] کە کارێکی زۆریان کردبووە سەر بیری‌و بەرەو هاوچەرخایەتی بردنی . هەروەك ئەوانیش بە کۆمەلێك رۆشنبیری لوبنانیان ناساندبوو .

ئەوانەی لەو سەردەمەدا « سەفوەت »یان دەناسی لەیادیانە ، کە بیری تازەو پێشکەوتن‌و رووکردنە جیهانی خوێندنەوەی هەمەرەنگ دەستکەوتی ئەو سالەی ژیانی بوو . تەنانەت هەر لە رۆژانی یەکەمی نەخۆشخانەوە هەر لە ناو نەخۆشخانەکەدا چوو بووە ناو دەورەیەکی فەرەنسی خوێندنەوە کە لەوێ ساز درابوو . کە هاتیشەوە وورده وورده بە فەرەنسی دەدوواو کۆمەلێك کتێب‌و فەرهەنگی لەگەل خۆیدا هێنابۆوە .

دەیگێڕایەوە دەیووت : لە سەرەتای سی‌یەکاندا ویستبووی ئینگلیزی فێربێت . هاوڕێیەکی موعەلیمی دەستی دابووە فێرکردنی . بەڵام زۆر خەڵك‌و بە تایبەتی هەموو مەلاکان لێی‌کەوتبوونە هەراو کتێبی ئینگلیزی هاتنە مزگەوتیان بە کافری دانابوو . بە ناچاری وازیان پێ لێ‌هێنابوو . ئەمجارەش ئەو چەشنە قسانەو نەبوونی کتێب ڕێگەی بەردەوامی‌یان لێگرت[10] .

« سەفوەت » ئەو جارە لەو دەردەی کە ئەو سەردەمە بە یەکێك لە دەردە گرانەکان دەزانراو لێ‌چابوونەوەی نەبوو ، چاك بۆوەو گەڕایەوە نیشتمان :

**نەمردم ئەم سەفەرەش ، چەرخی کۆنی دانە سواو**

**لە چارەیی ڕەشی « سەفوەت » گەلێکی گەی پێ هەس**

بەڵێ ، گەلێکی تری پێ‌هەبوو ، ئیتر لەو بیست ساڵەی‌تری ژیانی خۆیدا ، لەشی ساغی بە خۆیەوە نەدی ، ڕێگەی بەغداو هاتوچۆی لای پزشکان ، بۆ دەردی تازەو هەمەڕەنگە وەك ڕۆتینی ژیانی لێ‌هاتبوو . چەند جارێك گەیشتە ئەوەی پزشکەکان نائومێدی بکەن‌و ناچاری ئەوەی بکەن کە بچێتەوە سەر دەرمانگەریی یۆنان‌و ئیسلام‌و بە دەرمانی خۆماڵی خۆی چاك بکاتەوە[11] .

نەخۆشی لەلایەك‌و هەندێك چەرمەسەریی‌تری ژیان ، بە تایبەتی کۆمەڵێك کێشەو ئازاری نووسەری ئەم چەند ووشەیەو کەسانی‌تری ناو خێزانەکە[12] ، دەچوونە سەر خەم‌و ئازاری « سەفوەت » خۆی ، کە عاتیفەی بەتینی وای لێدەکرد بەدەم هەموویەوە بتلێتەوەو زۆرجار هەر لە جوغزی ئەم ئازارانەوە تەواو بە دەم ئازاری گشتی‌یەوە بناڵێنێت[13] ،

ئەمانە هەمــوو لاوازتریان کرد ، پاشـــــاوەی تەلێـــك نەخۆشی بێ‌ پێ‌نەهێشـــــــت ، تا ڕادەیەك لە جیهانی دەرس ووتنەوەو نووســـیناز دوورخستەوە ، بە تایبەتی لە دوو سالی دوایی ژیانیدا ۰ تا ئەوە بوو لــە ڕۆژی ١٩٦٣/١٢/٩دا بەدەم ئێش‌و ئازارەوە گیانی پاکی ســـپاردو پێش براکانی‌تری بووە یەکەم میوانی باوکی‌و لە ژێر سێبەری ئەرخەواندا بە خاکی سەیوان سپێررا ۰

سەفوەت‌و ناو کۆمەڵ :

« سەفوەت » لە سەرەتای لاوێتیدا ، لەپاڵ مەلایەتیدا ڕووی‌کردۆتــە تەسەوف‌و تەنانەت دەروێشیش ۰ پێوەندیی گیانیی بەکەســـانی دایکیەوە بەرەو نەقشبەندێتیی بردووە ، تەنانەت لە هەندێ نووسین‌و کتێبی کــۆنی خوێندنیدا بە « مستەفا خالیدی » ناوی خۆی بردووەو هەر ئەوەش تێکەڵی شێخانی تەوێڵەو بیــارەی کردووە ۰ هاتوچۆی لای شـــــێخ عەلائەدینی کردووەو سام‌و دیمەنی شێخ حیسامەدینی تەوێڵە ســـــــەرسامی کردووە ۰ بەڵام دوایی ڕێبازی تەریقەتی باوکی‌و شوێنی ئەو لە ڕیزی تەریقەتی قادریدا ( کە خەلیفەی کاك ئەحمەد بووە ) ، بەرەو ئەو تەریقەتەی بردووەو چەنــد سالێکی لاوێتی‌ی بە پێوەندی‌و هاتوچۆی شـــێخ حســـــەینی کربچنەوە بردۆتەسەر ۰ پاش شێخ حسەین ئەو پێوەندیی‌یەی کزبوو و پابەســـتی سەفوەتیش بە جیهانی ڕۆژانەو ( سلووك )ی دەروێشانەوە بڕاو هەر پاش ئەوە یەکـــەر بۆ چەند ســــالێکی ژیان کەوتۆتە چالاکیی ســـیاســـەت‌و کوردایەتی‌یەوە ۰

پێوەندیی باوکی بە « ئالی کاك ئەحمەد »ەوە : لە سەردەمی شـــێخ مەحموودی نەمردا بووە پێوەندیی کوردایەتیش ۰ حاجی مەلا ڕەســـوول پایەی سەرۆك ـ یا وەزیر ـی « شەرع‌و عەدل »ی سەردەمی شـــێخی

نەویست[١٤] • بەڵام لەو کەسانە بوو کە تا دووا هەناسە پشتی شێخیان بەرنەدا • کە شێخ لە هیندستانەوە گەڕایەوە ، ئەو پێش خەڵکەکە کەوت‌و بەیداغی ئینگلیزی لەسەر سەرای ئەوسا داگرت‌و لە مزگەوتی گەورەوە بەیداغەکەی کاك ئەحمەدی هێناو دایچەقاند[١٥] •

دیارە هۆش‌و گۆشی سەفوەت لەم زەوی‌یەدا گەشاوەتەوە ، هەر لەو سەرەتای لاوێتی‌یەشدا پێوەندیی گیانی بە گیانیی لەگەڵ مەحموود فەهمیی هەمەوەندا ، کە سەرەتاکەی لە پێوەندیی تێوان باوکی هەردووکیانەوە دەستی پێکردووە ، بەرەو کەسانی‌تر و کۆڕی نیشتمانپەروەری‌و کوردایەتیی دەبا • هەر ئەمە سەرەتای کوردایەتی‌و دامەزراندنی کۆمەڵی « برایەتی » بوو کە دووایی لەگەڵ کۆمەڵی « یەکێتی »دا بوو بە یەك‌و ناونرا « کۆمەڵی برایەتی‌و یەکێتی »و بە درێژیی ساڵانی سی ، لە زۆر شوێنی کوردستانی عیراقدا لق‌و ئەندامی هەبوو و چالاکی‌یەکی گەورەی نواندو جێی ئومێد بوو • هەر وەك لە مەیدانی کاری نهێنیی ئەوسادا خاوەن سامانی تازەی خۆی بوو •

« سەفوەت » سکرتێر یا ڕێکخەری ئەو کۆمەڵە بووە[١٦] • هەر پاش لە ناوچوونی ئەو کۆمەڵەش تووشی نائومێدی‌یەك بوو کە نزیك کاری ڕێکخراو نەکەوێتەوە • هەرچەندە بە گشتی لە هەست‌و گیانی نیشتمانپەروەری‌یەوە نزیك‌بوو •

ساڵی ١٩٤١ ، لە ڕۆژانی بزووتنەوەی مایسدا تەواو دژی ئینگلیز هەڵچووبوو . لەپاڵ عەبدولواحید نووری‌و گەلێك کەسی‌تردا ، یەکێك بوو لەوانەی لە کۆبوونەوەیەکی مزگەوتی گەورەی سلێمانیدا بە خوێن گەرمی‌یەوە خوتبە بداو داوای بەگژ ئینگلیزدا چوون بکات • ئەم مەسەلەیە ڕقی کۆنی ( ئینگلیزچی‌یەکان )ی سلێمانیی تازەکردەوە • زۆر لە ڕقەکەی ئەوسایان بەرامبەر بە شێخی نەمرو حاجی مەلا ڕەسوول ، بەسەر ئەمدا

ڕژان • پاش هاتنەوەی دەسەڵاتی ئینگلیزچی‌یەکان ، تووشی هەندێ ڕاونانو هێرشی ناڕەواو بوختان بوو ، تەنانەت ئەگەر تەماشای هەندێ لە ژمارەکانی ئەو سەردەمەی ڕۆژنامەی ژین بکەین ، دەبینین چۆن ئەو ئینگلیزچی‌یانە میری‌یان بۆ ئازاردانی شاعیر هاندەدا •

پاش ئەوە هەر بە هۆی مەحموود فەهمیی هەمەوەندەوە لە ساڵانی ١٩٤٦/١٩٤٨دا زۆر لە بەرەی چەپەوە نزیك‌بوو و خۆی بە دۆستیان دەزانی[١٧] • لە ساڵانی پەنجادا هەندێك جار لەگەڵ ئاشتیخوازاندا ناو و ئیمزای هەبوو ، ئەگەر سەیری رۆژنامەکانی ساڵانی ١٩٥٨ - ١٩٥٩ بکەین ، دیسان ناو و ئیمزای لەناو پشتگرانی بەرەی نیشتمانیدا دەبینین • هەروەك گەلێك کەس باسی هەڵویستێکی ئازایانەی ساڵی مردنی‌یان بۆ گێڕامەوە ، یەك لەوانە مامۆستا « ئەحمەد خواجە » بوو کە لە کتێبێکی دەستنووسی خۆیدا بە ناوی « سەدو یەك پیاو »ەوە بە پێی ڕۆژ ژمێر لە حوزەیرانی ١٩٦٣دا ، واتە شەش مانگ پێش‌مردنی باس لە هەڵوێستێکی مەردانەی « سەفوەت » دەکا • ئەمانە تێکڕا هەڵویست‌و پێوەندیی لاوەکی بوون • بەڵام بە گشتی لە کۆڕی کاری سیاسی‌یەوە دوور بوو •

دووریی شاعیر لە مەیدانی سیاسەتەوە ، دووری نەبوو لە جم‌وجوولی گشتی • ئەوەتا لە زۆر کۆبوونەوەی گشتیدا - بە بۆنەی مەولوودو موناسەبەتی‌تری ئاینی‌یەوە ، بۆ ئەم باربۆ و ئەو باربۆ ، لە هەندێك موناسەبەتی نیشتمانی‌و گشتیدا بۆ نموونە « یادی ژین ، چلەی ئەمین زەکی، چلەی بێخود •• هتد ، شاعیر خاوەن ووتار بووە •

لە زۆر مەیدانی‌تردا هەستی ئاینپەوەری‌و کوردایەتیی لا تێکەڵ دەبێت‌و هەندێ جار دەچێتە قالبی بەرهەمی ئەدەبی‌یەوە • وەك ئەوەی هەر بۆ بە کوردی خوێندنەوە « قەسیدەی بوردیە »ی کردووە بە کوردی ،

یا لەبەر ئاین و لەبەر کوردی ویستوویەتی فتوحاتی شام بە کوردی بچێتە جێی شانامە ، یا شانازیی بەوەوە دەکرد کە یەکەم کەسە خوتبەی جومعەی کردووە بە کوردی[18] ، یا یەکەم کەسە تەلقینی بەکوردی بۆ مردوو خوێندووە[19] •

مامۆستا عەلائەدین سەجادی باش لە یادێتی ، سالی ١٩٤٦ مەلایەکی بەغدا لە ڕۆژنامەیەکدا هێرشی بردبووە سەر مامۆستا ، چونکە بە مێزەرێکەوە چۆتە ئاهەنگی نەورۆزی لاوانی بەغدا لە هۆلی « گەل »ی « ئێستا »و بە لای مەلاکەوە ئەمە کارێکی ناپەسند بووە ••• هتد •

لە ناو مەلای کورددا تەنیا مەلا مستەفا سەفوەت بە نووسینێك و تەلگورافێك بۆ ڕۆژنامەکە لەسەر مامۆستا سەجادی و جەژنی نەورۆزی کردۆتەوە • هەروەك مامۆستا سەجادی نامەیەکی سەفوەتی پیشاندام کە پاش داخستنی گۆڤاری « گەلاوێژ » بۆی نووسیوە • سۆزێکی قوولی بەرامبەر بە گەلاوێژ و ووشەی کوردی لە قالبێکی ئەدەبیدا داڕشتووە •

□

## بەرهەمەکانی :

سەفوەت لە ژیانی خۆیدا تەنها ئەم بەرهەمانەی چاپکردووە .

١ ـ هۆنراوەی کوردی لە دوڕی بوردی . سلێمانی ، ١٩٣٥[٢٠] .

٢ ـ ڕابەری نوێژ . سلێمانی ، ١٩٦١ .

پاش خۆیشی لەلایەن نووسەری ئەم پێشەکی‌یەوە ئەم بەرهەمانەی بە چاپ گەیێندراون :

٣ ـ گولستان . وەرگێڕانی گولستانی سەعدیی شیرازی بە کوردی . بەغدا ، ١٩٦٨ .

٤ ـ شاتۆی ناومال . بەغدا ، ١٩٧١ .

٥ ـ ڕابەری حەج . بەغدا ، ١٩٧٣ .

٦ ـ دیوانی سەفوەت . بەغدا ، ١٩٨٤ ( ئەم دیوانەیە ) .

ئەو بەرهەمانەی کە لەناو کتێبخانەکەیدا بە دەستنووسی ماونەتەوەو چاپ نەکراون ئەمانەن :

٧ ـ مێژووی بەرزنجە :

برتی‌یە لە سەرەتایەكو باسی پەیدابوونی سیادەت ( سەیدێتی ) لە کوردستانداو باسی ئەو بنەماڵانەی لە ساداتی بەرزنجەنو لە کوردستاندا بڵاوبوونەتەوەو باسی پیاوی هەڵکەوتوویان (چ لە مەیدانی ئاینپەروەری‌و چ لە مەیدانی زانستو ئەدەبیاتدا ) .

٨ ـ ڕابەری ڕۆژووو •
٩ ـ ڕابەری زەکات •
١٠ـ کۆمەڵێك خوتبەی ئاینی ( چ لە ڕۆژانی جومعەو جەژنـداو چ لــە مووناسەبەتی تردا ) •
١١ـ هەشت بەهەشت کە لە ساڵی ١٩٥٢دا تەواو بووە • کارێکی ئەدەبی‌یە لە چەشنی گولســـتانی ســـەعدی • بریتی‌یە لە حیکایەتو باسو گێڕانەوە بە شیعرو بە پەخشان • بەشـێکی زۆری وەرگێڕانـە لــە ( ریاض الخلود )ی مەلا ئەبووبەکری موسەنیفەوە •
١٢ـ فتووحاتی شـــام :
بریتی‌یە لە ٤٥ هەزار دێڕە شیعر • لە زوربەی ڕووداوەکانیدا پشـــتی بە مێژووی ( واقیدی ) بەستووە[٢١] •
١٣ـ شازادەی غەسـان • وەرگێڕانی چیرۆکی ( فتـاة غـان )ی جورجی زەیدانە •
١٤ـ تەفسیری قورئان[٢٢] •
١٥ـ تەرجومەی نامەیەکی عەبدولحەلیمی میـــری بـە زیادکردنەوە ، کـە بریتی‌یە لە چەشنە سیرەتێك ( زوربەی بە شیعر کراوە بە کوردی ) •
١٦ـ دیوانی موحی ( محیی ) ـ وەرگێڕانی دیوانی فارسیی شـــــێخ عەبدولقادری گەیلانی‌یە بە شیعر •
١٧ـ گولزار ـ مەولوودنامەیەکە بە پەخشان ( نموونەیەکی جوانی سەجعی کوردی‌یە ) •
١٨ـ میعراج نامە ـ بە شیعر •
١٩ـ گولشەن ـ نامەیەکە کەمی پەخشانو زوربەی شیعرە • ( مێژوویەکی کورتی ژیانی پێغەمبەرو ئیسلامە ) وەك خۆی نووسیویەتی : زوربەی

له شێخی جزیری‌و ئیبنولحاجی جێشانه‌یی‌یه‌وه وه‌رگێڕاوه . له ٢٧ی زیلحه‌جه‌ی ١٣٦٤ - ١٩٤٥/١١/١١دا نووسراوه‌ته‌وه[٢٣] .

٢٠- وه‌رگێڕانی ( بانت سعاد )ی که‌عبی کوڕی زوهه‌یر - به شیعر .

٢١- نامه‌یه‌ك ده‌رباره‌ی نه‌خۆشیی سیل ( وه‌ره‌م ) . ئه‌مه‌یان به‌رهه‌مه‌ی سه‌رده‌می نه‌خۆشیی لوبنانێتی .. که دیاره بابه‌ته‌که‌ی کۆن بووه .

٢٢- کۆکردنه‌وه‌ی کۆمه‌ڵێك له فتوای مه‌لایانی کورد .

٢٣- نامیلکه‌یه‌ك به عه‌ره‌بی : « رسالة في العدل » سالی ١٣٧٥هـ - ١٩٥٦م نووسراوه : له یه‌که‌م لاپه‌ڕه‌یدا نووسیویه : « الى كل قلب رحيم ملؤه العطف والحنان ، يتأثر بشقاء الانسان ويبتهج باسعادهم . الى العادل الاعظم عمر بن الخطاب ( رض ) أهدى هذه الرسالة » .



## شـــــــیعرەکانی :

« ســـــەفوەت » خۆی لــە پێشــــەکی‌یەکدا کـــە بۆ وەرگێڕانی گولستانەکەی سەعدیی نووسیووە پێوەندیی خۆی لەگەڵ جیهانی شیعردا دەردەخات ، سۆزی ڕاستگۆیی دەدات بەو پێوەندیی‌یەی لە منداڵی‌یەوەو لە کۆشی کۆڕی مەلایانو شاعیراندا دەستی‌پێکردووە • سەیرکردنەوەی ئەو سەرەتایە دەروازەیەکی گەورەمان بۆ جیهانی شـــیعری ســـــەفوەت بۆ دەکاتەوە •

چەندە پێشەکی نووسین بۆ من زەحمەت بوو ، ڕەنگە هەڵسەنگاندنی شیعرەکانیشی ئەوەندە زەحمەت بێتو هەر زۆر زەحمەت بێت لە هەستی تایبەتیو عاتیفە دوور بکەومەوەو بڕیارێکی مەوزووعی بەسەر ئەم دیوانەدا بدەم • ئەم زەحمەتیەش لە خۆیدا هەر شـــتێکی مەوزووعی‌یە • چونکە بەوێ یا نا ، هەر بەشدار و تێکەڵی بەشێکم لە تەجروبەی شاعیر ، یا لــە نزیکەوە ئاگاداری هەژانو تەجروبەیمو لـــە هەموو کەس زیاتریش بـــە خوێندنەوەو ووتنەوەو لەبەرکردنەوە لەگەڵ شیعرەکانیدا ژیاوم • کەواتـە دووا بڕیاری من هەر باشو ئیجابی دەبێ • لەبەر ئەوە خۆم لــە هەندێك ووردەکاری دوور دەخەمەوەو هەندێ بڕیاری گشـــتی کە بە من دەدرێو ئەرکی منە لە جێی لێکۆڵینەوە دادەنێم •

رادەو جۆری ئەم شیعرانە هەرچۆنێك بن ، ئەوا لە هەموویاندا سۆزی هەستێکی ڕاستەقینە دەبینین •

ئەگەر هەستی ئاینپەروەری‌و موناجات بێت ، یا کوردایەتی‌و نیشتمانپەروەری بێت ، یا تەنانەت شیعری موناسەبەتیش بێت ، دەبینین موناسەبەتەکە ئەوەیە کە شاعیری جوولاندووە •

هەرچی شیعری دلداری‌یە ، ئەوا ئەگەر لە شارەزاییشەوە نەبێت ، هەر شیعرەکان خۆیان پێمان دەڵێن : کەوا بۆچرووکی دڵسووتاێکی ڕاستەقینە لە هەموو دێڕێکیانەوە بەرزدەبێتەوە • خۆشەویستی‌یەکی ڕاستەقینەی پەنهانی ، کە تا دووا هەناسە بە ژیان‌و پیرەوەری‌و لەگەڵ خۆدا موناجات‌و گۆرانی ووتن‌و ورێنەی ڕۆژانی نەخۆشیی گرانی شاعیرەوە دیار بوو ، بەڵام لە دڵدا جێی‌کرابۆوەو نەدەکەوتە سەر زار :

هەمووی ناسانە ، شەرتی عەشق ڕازی دڵ نەدۆڕانە
نەوەك مەجنوون کە لەیلای خستە زاری خۆ و بێگانە
ئەوا ( سەفوەت ) کە ڕازی بردە گۆڕ یار بێت‌و داپۆشێ

با کەمێك لابدەم‌و بڵێم ـ کە ئێستا بەڵگەو کەرەسە بۆ دەرخستنی ئەو ( ڕاز )ەو دەرخستنی ئەو پەنهانی‌یە کۆ دەکەمەوەو دەگەمە ئەنجام • هەر لەجیاتی شاعیر نەفرەت لە دوواکەوتنی وولات ، لە جیاوازیی چینایەتی دەکەم کە دڵی کوڕە هەژارو کچە دەولەمەند لە یەك جیادەکاتەوە • تەنانەت لەم چەرخی تەکنیك‌و ئەلیکترۆنەدا ، لەم چەرخەدا کە گەلانی ژێردەست‌و دوواکەوتوو بە چەکی وولاتی دەسەلاتدار ، بەڵام بە دەستی خۆیان سەر دەبڕرێن ، ئا لەم چەرخەدا شاعیر خۆی نا ، تەنانەت منیش هەقی دەربڕینی ئەو پەنهانی‌یەم نی‌یەو دەبێ منیش ئەو حیکایەتی عەشقە بیەمە گۆڕەوە •

تاقە توانایەکی من کە لەو زیاتر بێت هەر ئەوەیە نەفرەت لە بایەخی پارەپەرستی بکەم • نەفرەت لەوە بکەم کە خاوەنی مشتە دینارێکی بە ئارەقی ناوچەوانی خەڵك دزین‌و فڕوفیل ، لە ناوجەرگەی پیسایدا کۆکرابێتەوە ، لای هەندێك لە هەموو زاناو هونەرمەندو شاعیرو خەباتکەرێك بەرزتربێت • بەڵام دیارە شاعیر ئەو توانایەشی نەبوو •

بێمەوە سەر بەرهەمی شاعیرو بڵێم : ئەم بۆچڕووکە ڕاستەقینەیە ، شاعیر لە مەیدانی شیعری دڵداریدا ، لە ڕیزی لاسایی کلاسیکیی شاعیرانی هاوکارو هاوچەرخی خۆی لادەدات • هەرچی « سۆزی غەریبی »شە ، ئەوە دیسان دڵی پڕ لە تاسەی شاعیر دەجووڵێنێ • هەر لەبەر ئەوەیە ، ئەگەر بە ژمارە شیعری « سەفوەت » بەسەر تەمەندا دابەش‌بکەین • ئەوا ئەو ساڵی غەریبی‌و نەخۆشی‌یەی لوبنانی لە هەموو ساڵانی‌تری زیاتر بەردەکەوێت •

ماموستا شوکر مستەفا دەڵێت :

« بە شێوەیەکی سەیر ئاینپەروەری‌و خۆشەویستیی نیشتمان‌و نیشتمانپەروەری‌و یادگارو ژیانەوەی هەستی دڵداریی کۆن تێکەڵ دەبن‌و قەسیدەیەك دروستدەکەن »[٢٤] •

ئەم دیمەنەی ماموستا شوکر دەست‌نیشانی دەکات ڕاستگۆیی شاعیرمان لە مەیدانی شیعر نووسیندا بۆ دەردەخەن • شیعر لای « سەفوەت » ئەنجامی ئەندێشەو تەجروبەیەکە ، بەڵام چەند توانیوێتی ئەو تەجروبەیە سەرکەوتووانە بخاتە ناو « دێڕی هەڵبەست »ەوەو درەوشانەوەو گەشەو نەمری‌و داچەسپاندن بە تەجروبەکە ببەخشێ ، یا زاڵ‌نەبوون‌و نەتوانین ، لە تەجروبەکەی کەم کردۆتەوەو دەربڕینێکی بێ نموودو بێ

دیەنی لە شوێندا بەجێهێشتووە ، ئەوە دەدرێتە دەست ڕەخنەگرانو وا دەزانم ، بەرامبەر بە هەر قەسیدەیە بریارێکی جیاواز دەدرێو لە ئەنجامی هەموو ئەم بریارانەدا ، لە کۆڕی تاقیکردنەوەی گشتیدا دەنگ بۆ شاعیریی سەفوەت دەدرێت :

شـــاعیران پێریێ لـە دیوان بۆچی بوونـە ئەنوەری
من بەجێمابووم هەمە خۆ زەوقی شـیعرو شـاعیری
کێ ووتی ( ســـەفوەت ) مەهێنن بـا نەیێتە کایەوە
تـا وەکـوو خامجـاوی زوو بیکـەم تـەواوی گازری

یـــا :

( سەفوەت ) غەزەلییاتت ئەگەرچی هەموو خۆشـــن
ئەمما ئەمـە شـــیرداخە کـــەوا بێ بە هەوەسمە

بەگشتی « سەفوەت » بە بەردەوامییەکی شیعری کلاسیکیی کوردی دادەنرێ ، با بەپێی ڕۆژیش هەر لە قاوغدا نەمابێتەوەو هەندێك شـــەقلی سەردەمی خۆیی پێوەبێت •

شاعیر لە ووشە هەڵبژاردنو سەرلەنوێ دارشتنەوەدا ڕوودەکاتە کانو بناغەی ووشەی گردەوەبووی ئەدەبیاتی کلاسیکیی کوردیو ڕۆژهەڵات • بەڵام گوێچکەشی بەرامبەر بـە خۆیو چەرخو ووشـــەی تازەش کـــەڕ نییە[٢٥] • لە پاڵ « دڵ بە میحنەت ، جێم ئەما تیا بسرەوم ، ســـــــەحرا نەوەرد ، مەه جەبین ، تەبیبی حـازیق ، مەحەبەت ، ڕەندو قەڵـەندەر ، ئالوودەی گوناهە •• هتد » دا « مەمرەو مەژی ، دوو قۆڵـە میر ، کۆرپەیی نەوڕەس ، گریەو گر ، وەك چیا هاتە هەرەس ، بدا بە سینەو ســـــەردا ، خورژمی باران ، چـۆن نـەبرژێ ، چۆن نەقرچێ ، بەلەمەڕیش ، گورگن ، شلومل ، لێوی ووشكو گۆنەیی زەردم ، قەڵوبەردم •• هتد » دەبینی •

یا هەر لە یەك دێڕدا « ماهـ ڕوخ‌و حۆریی جینـان » لەباڵ « پووزی خڕو قۆڵی سپی‌و گۆنەی سوورو تەپ‌وتل »دا دادەنرێن •

هەرچی کێشی شیعرە ، دیسان دەتوانین بناغەو سەر بـە کلاسیکیتی لەپاڵ ئاسانکردنی هاوچەرخانەی خۆیدا ببینین •

مامۆستا شوکر مستەفا لەو کاتەدا کـە لـە ئامادەکردنی دیوانەکـەدا یارمەتیی ئەدام ، سەرژمێرێکی کێشە جیاوازەکانی دیوانەکەی کردو ئـەم چەند دێڕەی نووسی :

« ١ ـ زوربەی لەسەر کێشی ( ڕەمەل )ن

فاعـلاتن فاعـلاتن فاعـلاتن

ــ ب ــ ب ــ ب ــ ب ــ ب ــ ب

بابەتی جیاوازی تریشی هەیە •

٢ ـ ( هەزەج ) لە پلەی دووەمدایەو گۆڕین لە جۆری هەزەجەکەدا هەیە :

مفاعیلن مفاعیلن •••

ب ب ــ ب ب ــ ب ب ــ ب ب ــ

٣ ـ بەسیت ( البسیط ) لە پلەی سێیەمدا دێت :

مستفعلن فاعلن

ب ب ــ ب ــ ب ب ــ ب ــ

٤ ـ شیعری لەسەر کێشی موزاریع ( المضارع )یش هەیە •

٥ ـ هەندێك شیعریشی دەچێتەوە سەر کێشی پەنجە ( هیجا ) •

٦ ـ سەلیقەو سروشتی خۆی لەم مەیدانەدا زاڵە بەسەر شیعرەکانیدا »[٢٦] •

بۆ قافیەش ، زۆرتر خووی بە ڕێبازی قافیەی کلاسیکیەوە گرتووەو هەندێك جار نا •

دیارە ئەگەر تێکڕا لە جیهانی عەرووزکاریدا لـە شیعرەکان بدوێین ،

ئەوا لەگەڵ تێبینی‌یەکانی مامۆستا شوکر مستەفادام ، بەڵام بۆ هەموو شیعری کلاسیکیی کوردیو عەرووز هێشتا لەسەر ئەو ڕایەم کە لە پێشەکیی دیوانی کاکەی فەللاحی شاعیردا نووسیبووم :

« لێرەدا دەووترێ کێشی کۆنو ناووترێ عەرووز ، چونکە کێشی عەرووز بە پێی پراکتیکە تەواوە عەرەبی‌یەکەی لە کوردیدا نی‌یە • زوربەی ئەوانەش کە لەسەر کێشی عەرووزیان نووسیووە • دانیان بەمەدا ناوە »[27] •

ئەمە بۆ کێش ، هەرچی مەیدانی قافیەشە ، بامنیش دوو ووشە بخەمە سەر قسەکانی مامۆستا شوکرو بڵێم :

لە پاڵ ئەوەدا کە خۆی بە هەموو قانوونەکانی قافیەی شیعری کلاسیکی‌یەوە بەستووەو ئەگەر لێشی دەرچووبێ ، ئەوا هەر لە سنووری لێدەرچوونی هەندێ باڵی شیعری کلاسیکیی کوردیدایەو بەرەو ( مەسنەوی ) یا ( موستەزاد ) چوونی کێش‌و قافیەیە • بەڵام زۆر کەمیش هەست بەوە دەکەین کە بە دەست یەکێتی‌ی قافیەوە ماندوو بوویێت‌و ناچاری لە ڕەوانی‌و شێوەی قافیەی گۆڕیبێ[28] • تەنانەت کە هەندێ کەرت‌کاریش لە قافیەدا دەکات هەر هەست بە زۆر لە خۆکردن ناکەیت • بۆ نموونە با بڕوانینە ( جیناس )و ( کەرت‌کاری ) لە دێڕێکدا کە دەڵێ :

خەیالی عەشقی هێند گەرمە لەسەرما
لە زستانا نی‌یە باکم لە سەرما

لێرەدا ( لە + سەرم + ا ) = ( لە + سەرما ) دەبینین‌و قافیەش هەربەرەو ( بێخەبەرما )و ( دەست مەکە مل )و ( هاو مل )و ( شل‌و مل ) دەڕواو تۆش لەگەڵ شاعیردا هەر بەردەوامیت •

کە سەفوەت لە شینی « بێخود »دا دەڵێ :

مەولەوی‌و کوردی‌یو ســـالم وەکو حاجی‌و نالی
مەحوی‌یو موخلیس‌و خاکی وەکـــو عیرفانم ڕۆ

ئەمە لەپاڵ شینی ئەودا بۆ « ســــەدری ئەدیان » کە لای ئـەو بۆ سەردەمی خۆی « بێخود »ە ، ئەوە پێوەندیی خۆی لەگەڵ جیهانی شیعری کوردیدا دەست‌نیشان دەکات ، کە جیهانی کلاسیکیتی‌ی نالی‌و کوردی‌و سۆفیتیی مەولەوی‌و کوردایەتیی سالم‌و حاجی‌و بەردەوامیی ئاڵای شیعری سلێمانی‌یە ، بە دەست مەحوی‌و خاکی‌و موخلیسەوەو(٢٩) سەر بە مەشخەڵی زانست هەڵگرتنی « عیرفان »ە لە خاکی باباندا .

ئەم سەر بە مەڵبەندی تایبەتیی شیعربوونە ، وای‌کردووە کە گـەڕانی زۆری نەوێ تا زۆر بابەتی ئەو قوتابخانەی شــــیعرە لــە بەرهەمەکانیدا بدۆزینەوە .

شیعرەکان خۆیان زۆر نین . بەڵام لەو مەیـدانـە بچووکەدا لـەپـاڵ پرەکتیکی کێش‌و قافیەدا ، « تەخمیس »و «تەشتیر»و «مولەممەع» دیارە ، « موعەمما » بە کێش‌و قافیەی شیعر داڕێژراوە . تەشبیهـ‌و ئیســـتیعارەو تەوریەو جیناس دیارن . ڕەنگە هەندێ دیاردە بدۆزینەوە کە ببنە نموونەو لە ڕیزی شیعری شاعیراندا بکەونە سەر زمان :

من ســـــەرم دانـا لــە ڕێبـازا کـە تۆ پێی لێ‌بنێیت
کەوتە ژێر پێی ئەو ڕەقیبە ، هەی سەری خۆم دا لــە بەرد

لەگەڵ ئەوەشدا شەقلی پلەیەکی دووای ئەو شـــاعیرانە بە بەرهەمی « سەفوەت »ەوە دیارە ، دەڵێم « شەقڵ »ی زەمانێکی دووای ئەوانو ناڵێم بەرەو پێش‌بردن . هەر ئەمەشە « تەپڵ لێدانی لەشکری حەبەش‌و سـوپای هیند » لە مەیدانی تەشبیهی زولف‌و پرچ‌و خاڵدا دەگەیەنێتە سالی ١٩٥٦و دەڵێ :

**سوپایی جوو و فەرەنگ ، ئینگلیزی ماتەم**
**هوجوومیـــان بردە ســـەر سیناکەیی دڵ**

ئەمەش بۆ چوونێکی زیرەکانەیە ، چونکە هـــەر لـــە مەیدانی ئـەو تەشبیهەدا « سینا »ی خاکی عەرەب و موســـوڵمان دڵی ئەمەو هێرشـــە سۆقوڵی‌یەکەی هێرشی « ماتەم »ە بۆ ســـــەر « دڵ »ی شـــاعیر • با خوێنەریش چەند مەبەس و وێنە بۆ خۆی لەگەڵ یەکـــدا تێکەڵ بکات • یا هەر لە شوێنێکدا کە خۆزگە بە سۆفی‌یەك دەخوازێ کە گۆشەگیر بێت و دوور لە مەبەسی دنیا پەرستی بێت دەڵێت :

**خۆزگـــە بـۆ زاتێ ئەوەنـدە بێ هیـــوا بێ و بێ ئـەمـەل**
**جرت و فرتی ( جەبر ) و ( نووری ) نەیخەنە سەر فاك و فیك**

لێرەشدا هەر گێڕانەوەیەکی تەواوی شرێتی ڕۆژ و ڕووداوی ســـاڵ و هەلوێست دەربڕین لە کونجی گۆشەگیری‌یەوە دەبینین •

کەواتە ، چ مەبەسی کۆمەڵایەتی و چ بیری تایبەتیی شـــاعیر لە زۆر مەسەلەی ڕووداوی ڕۆژدا بە خەتێکی باریکی نووکە پەڕی شاعیر لەســەر تابلۆی قەسیدە دەردەبڕێ و تیژ بە لایدا تێدەپەڕێ :

**تێر کـەی لـە برسی بووە ئاگـادار**
**نـازانن چی‌یە کـەســـاسیی هەژار**

با پێکەوە بچینەوە سەرەوکاری قەسیدەیەك و لە خەلوەتی چەند شەوەی دوور لە جیهان و موناجاتی سۆفیەکدا گوێ بدەینە دەنگێك کە دەڵێ :

**چەندە پێم خۆشە بە کوردی دەنگی خـالـەی ڕێبوار**
**ڕێبـوارە ئەهـلی دنیـــا هەرچی هات و هەرچی چوو**



وا بزانم گەلێك وێنەو لێكدانەوە لە ئەنجامی لێووردبوونەوەی ئەم دێڕەدا بەسەریەكدا دەكەون . ئەگەر ماوەی ئەم نووسینە ژووری دەرسخانە بووایە ، ئەوا چەند دەرس بۆ سووچی جیاجیای ئەو دێڕە تەرخان دەكرا . ئایا لە ئەنجامدا هەر ئەو سۆزی كوردایەتی‌و بیری كوردە نابینین كە لە هەموو شیعرە نیشتمانی‌یەكانی شاعیردا دیارن ئایا ئەو خۆشەویستی كوردو نەتەوەو خاك‌و مێژوو و پەندی ژیانەی نابینین كە دەبنە بناغەیەك بۆ شاعیر كە لە ڕێی پاراستن‌و ئەمڕۆ و سبەینێیدا دەربەست نی‌یە كە مێزەرەكەی خۆیی بۆ بكا بە تەناف‌و ئەگەر وێژدان‌و دان بە ڕاستیدا نانیش هەیێت ، زۆر جار خۆی گەیاندۆتە نزیكیی ئەو ئەنجامە .

شاعیر سۆفی‌یەو زۆر جار موناجاتەكانی لە گردەوەبووی ووشەی ناو سۆفیانەوە هێناوەو ویستوویەتی شتێك لە سامانی ئەم ئەدەبیاتە لە ناو كورددا زیاد بكات ، بەلام هەر وەك سۆفیانی‌تر لە « شطحات » خۆی لانەداوە :

**چیت ئەوێ لەم خەلكە چی داوا ئەكەیت**
**عالەمێ بۆچی وەها ڕیسوا ئەكەیت**

یاخود پلە و ڕوتبەی عەشق ، هەر لە باسی ئەو بۆچڕووكەی دەروونی خۆیدایە كە دلی ( تیر )ی یار ئاگای لە دلی برسیی ئەم نەبووە . یا هەر عەشقەكە عەشقی سۆفیانەیەو گەیشتنە پلەو ڕوتبە هونەری تایبەتیی دەوێت :

**وەقتێ هەتە ڕوتبە لە عەشقدا بە هەناسە**
**بتوانی كە ئەو زولفە لەسەر ڕوومەلی لادەی**

یا هەر ئەو هەناسەیە ، بادی خۆش مرووەرەكەی نالی‌یەو شاعیر هەر جارە بە جۆرێك دەیكا بە پەیكی شارەزای خۆی :

هەناسە هەلســـە لە لوبنانەوە برۆ دەمو دەس
هەتاکو شـــاری سولەیمانی لامەدە لای کـەس
. . . . . . . . . .
بەلا لـە دوورەوە ڕاوەستە کـەس مەسووتێنە
بـە گریەوو گرەکـەت بـا دلم بسووتیو بەس

که جۆرەکەی تریان ، تەواو پێچەوانە دەبێتەوە :

پەیکی دلسۆزی عالەم شــەمالــە پەیکی من بای وەشــت
سەرەو ژوور بڕوا بگاتە مۆسکۆ بــە ســەیرانو گەشت

ژیانی شاعیر ئازارو مەینەتیو گەڕانو نەخۆشـــیی زۆر تێدا بووە ، کێشەی نێوان کۆنو تازە ، نێوان بیرو خۆ بۆ مەبەسی جیا تەرخانکردن ، هەر ڕەنگە سۆفیزم بە دەنگ ئەم هەموو خواستو بۆچوونـە جیـاوازانەو بەدەم ئەم تێکەلیی بیرەوە بێت :

« سەفوەت » ، ئەمە سیرڕێکە لە مزگەوتەوە بۆ دێر
خۆ تـۆ بـە حیســـابی لـە هـەواخواهی مەدینەی

ئـەم دیوانـە :

ناتوانم بلێم ئەم دیوانە هەموو شیعری « سەفوەت » دەگرێتـــەوە ، چونکە هەر لە باسی بەرهەمەکانیدا ؛ لە مەیدانی وەرگێڕاندا باسی چەنــد بەرهەمێکی دی کە دەچنە جۆری شیعرەوەو بە هەزاران دێڕە شـــیعرن ، بەلام لێرەدا ، هەرچی وەرگێڕانە ، « قەسیدەی بوردیە » کــە نەبێت ، ئەوانیترمان خستە لاوە ، تا لە دەرفەتێکدا وەك بەرهەمی جیاواز چاپیـــان بکەین .

کەواتە ئەم دیوانە زوربەی ئەو شیعرانەی ( سەفوەت )ن کــە خۆی نووسیونیو دەست ئێمە کەوتوون .

ئەوەندەی من بزانم « سەفوەت » لە ژیانی خۆیدا کەم شیعری بڵاوکردۆتەوە[٣٠] • ئاگاداری زۆر پارچەی بڵاونەکراوەی بووم • ئەوەبوو کاتێ کۆچی دوایی‌کرد ، من لە دەرەوەی وڵات بووم ، فارووقی برام لە بارێکی تایبەتیدا بوو • ئیتر بێ ئاگاداری ئێمە کتێبخانەکەی لە مزگەوتەوە هێنرابۆوە ماڵەوە[٣١] •

کە ساڵی ١٩٦٦ گەڕامەوە سلێمانی‌و ناو کتێبەکانم پشکنی • دەفتەرێکی شیعرم دۆزی‌یەوە ، بە خەتی شاعیر خۆی نووسرابوەوە • سەرەتا نووریی مەلا مەحموودی ( ئامۆزام ) لەبەر ئەو دەفتەرەو لەبەر چەند پارچە کاغەزێك شیعرەکانی بۆ نووسیمەوەو دوایی نووسینەوەکەی ئەو و کۆمەلی پارچە کاغەزی جیا جیام دایە دەست هاوڕێ‌و برای دێرینم مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم ، بە بەراوردو ڕاستکردنەوە گەڵاڵەی ئەم دیوانەی دروستکرد • لەم دوایی‌یەدا کە کتێبەکان لە سندووق دەرهێنران ، هەندێ پارچەی‌ترمان دۆزی‌یەوە • مامۆستا شوکر مستەفا دلسۆزانە لەگەڵما دانیشت‌و هەموو دەستنووسەکانمان بەراوردکردو تەنانەت هەندێ قەسیدەی نەنووسراوەی بە خەتی خۆی نووسی‌یەوە •

بێگومان بەشێکی زۆر لە شیعرەکان بە ئیملای کۆن نووسرابوون • بێجگە لەوەی کە زۆریان هەر ڕەشنووس بوون‌و جارێکی‌تر نەینووسیبوونەوە • لەبەر ئەوە ئامادەکردنی دیوانەکە زۆر بە ئاسانی بەدەستەوە نەهات • هەروەك جاروبار کە تاقە دێڕێ یا چەند دێڕێك بە خەتی شاعیر دەبینرایەوە ، دەیخستینە گومانەوە ، چونکە دەگونجێ شیعری خۆی نەبێت • لەبەر ئەوە بە زۆر دیواندا گەڕاین‌و ئەوەی لێی دلنیابووین تۆمارمانکرد •

ڕەنگە هەندێك پارچەو دێڕ ڕادەی ئەوەی نەبێ کـــە لـەم دیوانەدا تۆمار بکرێت • بەڵام وام لا باش بوو هەر تۆماری بکەم ، چونکە هەموو شاعیرێك بەرهـــەمی بەرزو بەرهەمی کزی هەیەو تۆمـــارکردنی ڕێگەی بڕیاری ڕاست بۆ ڕەخنەگر خۆش دەکات • هەر وەك جاری وا هەیە چەند دێڕێك لە ڕووی هونەرەوە کزە ، بەڵام دەبێتە نیشـــــانە بۆ شتێکی‌تر • بۆ نموونە ئەو چەند دێڕەی ساڵی ١٩٢٨ بۆ زانســـــتیی نووســـیوە ، لەکاتێکدا کـــە زوربەی مەلا ئەوسا هـــەر خوێندنی قوتابخـــانەیـــان لاحەرام بوو •

بە هەموو حاڵ ڕەنگە شیعری‌تری بڵاوکراوە یا دەستنووسی شـاعیر هەبێت کە دەستمان نەکەوتبێ • بەڵام ئەوانە هەر چۆنێـــك بن هــەر لـەم بابەتانەن‌و لەو بڕیارە ڕەخنەگری‌یە ناگۆڕن کە بە هۆی ئـەم دیوانـــەوە بەسەر شاعیردا دەدرێن • هەرچی ڕێکخستنی دیوانەکەیە ، لەبەر ئـەوەی زوربەیان مێژووی نووسینیان دیارنەبوو ، هەنـدێکمان بـە بـاس‌و بەو مەزندانەدا ساغکردەوە کە لای قەسیدەکان نووسرابوون‌و بۆ هەندێکیشیان کاغەز بەڵگەی داینێ • بەڵام تێکرا وام بە باش زانی ، کە بۆ ئەوانەی تەواو لەسەر ڕەویەو قافیەی کلاسیکین ، ڕێی ئەلفوبێ بگرم‌و ئەوانەی قافیەیـان مەسنەوی‌یە بکەونە دووای ئەوانەوە •

ڕایەك هەبوو کە ئەو پارچانەی سەر بە جیهانی ئاینپەرستین بە جیا چاپ‌بکرێن‌و نەخرێنە ئەم دیوانەوە • بەڵام ئەمە بیری تەواوی دەربـارەی ئەفراندنی شـــــاعیر دەشـــێواندو زۆر خوێنـــەریشـــی لـە دیوانـەکـە دووردەخستەوە • لەبەر ئەوە ئەو قەسیدانەی لەسەر پێڕەوی شـــیعری مەلای جزیری تا بێخود ئاین‌و عەشــــق‌و مەبەسی‌تریان تێدا تێکەڵ‌کراوە ، لە ناو دیوانەکەدا دانران‌و ئەوانەی هەر موناجات‌و ئاینپەرســتین بوونـە

بەشی دووەم‌و چوونە پاڵ قەسیدەی بوردیەکە . بەڵام ئەمە وا ناگەیێنێ کە شیعری ئاینیی‌ترمان لانەخستووە . ئەوەتا وەك لە بەرهەمەکانیدا دەبینین ـ کۆمەڵێکی زۆر وەرگێڕانو بابەتی میعراج‌و سیرەت سەر بە جیهانی ئاینپەرستین‌و چاپکردنیمان خستە دەرفەتێکی‌ترو بەجیا .

دووا ووتە :

سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی کۆششی مەردانەیان بووە یاریدەدەری دەرچوونی ئەم دیوانە . بۆ کاکە حەمە ، بۆ مامۆستا شوکر ، بۆ مامۆستا کاکەی فەللاح کە دیوانەکەی خوێندەوەو گەلێك ڕای شاعیرانەی بەنرخی لە نوسخەگەری‌و ڕاست جێگیرکردندا دامێ .

کۆتایی ـ ئەمە سەرەتاو پێشەکی‌یەك بوو ، بەڵام بە لای منەوە هەورازێکی سەخت بوو بە سەریدا سەرکەوتم . ماندووی کردم ، چونکە هەموو تینێکیم پێوا و لە لادانی سەر بە عاتیفە دەترسام . بەڵام ئایا ئەو « سەفوەت »ەی بە دەردەداری‌و ئازارەوە ئەم هەموو شتەی بۆ گەلەکەی نووسیوە ئەم چەند دێڕە هەڵناگرێ ؟ . بەڵێ ئەگەر کەسی‌تر هەبوایە ، دەبوو من دەست نەدەمە قەڵەم . بەڵام ئەگەر واش نەبێ ، گەلێك یادگارو ڕاستی دەفەوتێ .

لە وەڵامی هەموو بڕیارێکتاندا یا دەڵێم سوپاس ، یا دەڵێم گەردتان ئازاد بێت .

بەغدا ١٩٨٢/٧/١

## پەراوێز :

١ ـ دوکتۆر کامیل بەسیر لە ووتارێکی ئێستگەی ڕادیۆدا بایەخێکی باشی بە دیوانی ( هۆنراوەکانم )ی ( ن ٠ ئاری )داو گلەیی ئەوەی لە من کرد کە بۆچ پێشەکیم بۆ دیوانەکە نەنووسیوەو باسی ژیانی شاعیرم نەکردووە ٠ ئەمە پاڵپێوەنەر بوو کە لە چاپی دیوانی ( سەفوەت )دا پێشەکی نەخەمە پشتگوێ ٠ هەر وەك ئەو ووتارەی دوکتۆر بەسیر تاقە باسی ئاریو دیوانەکەی بوو ، مامۆستا عەلائەدین سەجادیش ئەم چەند دێڕەی بۆ تۆمار کردووە ٠

( ئاری : ١٩٠٩ ـ ١٩٦٨ ٠ ناوی نەجمەدینو کوڕی حاجی مەلا ڕەسولی دێلێژەیی یە ، لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیاوەو لەوێش سەری ناوەتەوە ٠ ئاری لە ڕێگای نیشتمانیەوە بۆ کورد گەلێ دلسۆزیی نواندووە ) [ علاء الدین سجادی ٠ مێژووی ئەدەبی کوردی ٠ چاپی دووم ، ١٩٧١ ، ل ٦٠٣ ] ٠

( ن ٠ ئاری ) لە ژیانی خۆیدا تەنیا وەرگێڕانی چیرۆکی یا شانۆگەریی ( لە پێناوی نیشتماندا )ی چاپکردووە ٠ پاش کۆچکردنی بە ماوەیەکی کەم کۆمەڵە شیعرێکیم بە ناوی ( هۆنراوەکانم )ەوە بەچاپگەیاند ، کە خۆی کۆی کردبۆوە ٠ چیرۆکی ( شێرەکەی فەلاندەرزەر )یشی کردووە بە کوردی٠ شیعری تریشی هەیەو نووسینی زۆری لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی یەکاندا هەیە ٠ هیوادارم بتوانم ئەوانەش بگەیێنمە کتێبخانەی کوردی ٠

٢ ـ دیوانێکی موخلیس ( ١٨٣٥ ـ ١٩٢٧/٨/٣١ )م لەو پارچە بەیازانەوە کە لە کتێبخانەی « سەفوەت »دا مابوون کۆکردۆتەوە ، بەڵام وەك لە مەلا مەحموودی مامم بیستووە ئەمە دیوانی تەواوی نی یە ٠

چونکە دیوانەکەی بەنووسراوەیی لە کاتی بوردومانی سلێمانیدا لەلایەن ئینگلیزەوە ، لە دەوری شێخ مەحموودا سووتاوە . لەگەڵ ئەوەشدا ، هیوادارم ئەم پاشماوەیە بە چاپ بگەیێنم .

٣ ـ مامۆستا عەلائەدین سەجادی دەربارەی فایز نووسیویە :

( فائیز ١٨٩٢ ـ ٦/٤/١٩٧٠ : ناوی ئەحمەدو کوڕی حاجی مەلا ڕەسوولی دێلێژەیی‌یە . لە شاری سولەیمانی هاتۆتە دنیاوە . لە خانەقی کۆچی دوایی کردووەو تەرمەکەی براوەتەوە بۆ سولەیمانی ، لە گردی سەیوان نێژراوە . شاعیرێکی بەرزو عالێکی بەرزتر بووە ) .

[ علاء الدین سجادی . مێژووی ئەدەبی کوردی . چاپی دووەم ، ١٩٧١ ، ل ٦٠٠ ] .

فائیز لە مزگەوتی عیرفانی سلێمانی‌و لە بلێ ( زیبار )و لە سالانی دوایی ژیانیدا لە مزگەوتی گەورەی خانەقین مودەڕیس بووە . دیوانێکی باشی شیعری هەیە . کاتێ دوکتۆر مارف خەزنەدار خەریکی ئامادەکردنی باسێ بوو پێکەوە چووینە شارەبان لای عەبدولقادری کوڕە گەورەی حاجی مەلا ئەحمەد ( کە ئامۆزامە )، هەموو بەرهەمی شیعری باوکیی لەگەڵ چەند بەڵگەدا بۆ سوود لێ‌بینین دا بە دوکتۆر مارف . ئەوەبوو ئەویش لە باسەکەیدا بە چەند لاپەڕە باسی ( فائیز )ی کردووەو ئیشارەتی بۆ ئەو یارمەتی‌یەی کاك عەبدولقادر داوە ( بڕوانە : دوکتۆر مارف خەزنەدار « شیعری بەرزی هەندێ لە شاعیرە کەم ناسراوەکانی کورد » گۆڤاری « کۆلێجی ئەدەبیات » ژمارە ١٩ ، ١٩٧٦ ، ل ٤٤ ـ ٤٩ ، ل ٥٣ ) .
هیوادارین یا کاك مارف ئەو بەرهەمانە بە چاپ بگەیێنێت ، یا وا بکات بگاتەوە دەست کوڕو برازاکانی بەلکو چاپی بکەین .

٤ - مەلا محەمەد - دووەم کوڕی حاجی مەلا ڕەســـوول بووە • لــە ناوەڕاستی ساڵانی بیستدا کۆچی دوایی کردووە • لە کۆیە لـــە مزگەوتی مەلا باوەدین خوێندوویەتی • کۆمەڵی شیعری ئەویشـــم لەلایەو چاوەڕێی چاپن •

٥ - حاجی مەلا مەحموود ( ١٨٩٥ - ١٦/١٢/١٩٧٣ ) زۆر بیری تیژ بوو ، سنگی کەشکۆڵێکی گەورە بوو ، قسە خۆش بوو . بە یادگـــاری ڕەنگین‌و شێوەی جوانی شیعر خوێندنەوەی مەجلیسی ئەڕازاندەوە • ناشی هێندە ساغ بوو ، پیرێکی هێندە تۆکمەو بەخۆوە بوو ، پیری پێوە دیار نەبوو و بەبیرمانا نەدەهات مردن وا زوو بیفڕێنێ • زۆر لە یادگارەکانی تۆمار نەکران‌و لەکیس چوون •

٦ - مەلا فاتمی مەلا محەمــەدی چاوهار • **بۆ باسی ئەو بڕوانە :**
[ نەریمان • مامۆستای نەمر • بەغدا ، ١٩٧١ • ل ٧٤ ] •

٧ - مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسوول ، یـەکێکە لـەو مزگەوتـانەی لـــە سـەرەتای دروستکردنی سلێمانی‌یەوە دروســـتکراون • حاجی مـەلا ڕەسوول هەر لەو کاتەوە کـە بووە بـە مەلا لـەو مزگەوتە بووە • لەبەر ئەوە لەناو خەڵکدا بە ناوی ئەوەوە ناسرابوو • پاش دروست بوونی حوکومەتی عیراق هەر خۆی لە کاروباری ڕەسمیدا بە ناوی ئەو کەسەوە کە دروستی کردووە ناوی ناوە مزگەوتی (باش‌چاوەش) ( ئەم باشچاوەشە باپیری ئەورەحمان ئاغای ئەحمەد پاشـــایە ) • بەڵام کە سالی ١٩٦٢ مزگەوتەکە بـــەر جادە کـــەوت لای گـردی سەیوانەوە مزگەوتێکی تازە لە جێی ئەو دروستکراو مەلا مـــتەفا سەفوەت دووا ڕۆژانی ژیانی خۆی لەوێدا بردەسەر •

٨ - ئەوەی من بیستوومە ئەم خوێندنەی لە گوندی ( فەرقان )و لە ساڵانی جەنگی یەکەمدا بووە • بەڵام مامۆستا مەلا جەمیلی کوڕی مەلا ئەحمەدی فەرقان دەڵێ : ئەمە لە گوندی ( باداوا )ی نێوان لەیلان‌و

ساڵەیی سەر بە ناوچەی ( قەرە حەسەن )داو لە سالآنی ١٩٢٧ ـ ١٩٢٨ بووەو لەگەڵ مەلا مەحموودی دێلێژەو مەلا مارفی خاوێدا لەوێ خوێندوویانەو وەك ئەو دەڵێ : ( سەفوەت ) ئەو سەردەمە کتێبی عەبدوللا یەزدیی خوێندووە • من لام وایە ئەم مێژووەی مامۆستا مەلا جەمیل لەبیرچوونەوەی تێدا بێت ، چونکە ئەو بەڵگە ڕەسمی‌یانەی لە بەردەستمدان نیشانەی ئەوەن کە « سەفوەت » لە ساڵی ١٩٢٨دا لە سلێمانی مودەڕیس بووە •

٩ ـ لەوانە مامۆستا بەکر مستەفا سالم بوو ، کە لە ناو مامۆستایانی عیراقدا بە تێکۆشەرێکی نەقابیو خاوەنی بیری دامەزراندنی نەقابەکەیان دەزانرێ • هەروەها دوکتۆر موحسین جەمالەدین ، کە تا مردن دۆستی شاعیر بوونو لە هاتوچۆی یەکتر نەبڕان •

١٠ـ منداڵ بووم ، ڕۆژێك لە مزگەوتەکەی خۆمانەوە بەرەو لای بازار لەگەڵیا دەچووم • بە کۆمەڵێك کتێبو کاغەزەوە لەسەر ڕێ لای دایە ماڵی مامۆستا ڕەفیق حیلمی • نازانم کارەکە چی بوو ، بەڵام دەزانم کارێك بوو سەر بە فەڕەنسی زانین بوو ، داوای یارمەتیی لێکرد • مامۆستا ڕەفیق حیلمی وەڵامی ئەوە بوو :

ـ کاکە مەلا ئێمە کە لە قوتابخانە فێری بووین لە بیرمان چۆتەوە ، تۆ دەتەوێ لە مزگەوتا فێری فەڕەنسی بیت • بەڕاستی بمتوانیایە یارمەتیم ئەدایت •

جا نازانم مامۆستا ڕەفیق حیلمی خۆی دەربازکرد یا بەڕاستی لەبیری چوبۆوە • چونکە دڵنیام کە « سەفوەت »ی زۆر خۆشدەویستو بە شاعیری باشیشی دەزانی • « بڕوانە : ڕەفیق حیلمی • شیعرو ئەدەبیاتی کوردی • بەرگی دووەم بەغدا ، ١٩٥٦ ، ل ٦ » •

١١ـ کورد دەڵێ : بە سەد حەکیم بە قەد دەردەدارێك نازانن • وەك ووترا ـ « سەفوەت » دەچۆوە سەر کتێبەکانی « یۆنان »و

( ئیبن سینا )و ئەوانیتر کە لە ناو مەلایاندا باون • بۆ ئەم باسە هەندێ بیرەوەریو هەندێ لاپەڕەی نووسراویم لایە کە بۆ کەسی خۆی لە سوود بەدەر نییە •

١٢- شاعیر دوو کوڕو سێ کچی لە پاش بەجێما • لە ژیانی خۆیدا تاقە کچێکی مردووە •

١٣- سالی ١٩٦١ من لە یەکێتیی سۆڤێت بووم ، بیستم ( فاڕووق )ی برام لە بەغدا گیراوەو باوکیشم هەر لەسەر ئەو پێڕەوەی لەگەڵ مندا دەیکرد ، هاتۆتە بەغداو ماوەی بەندێتیی ئەو لەوێ دانیشتووەو کەوتۆتە هەوڵو تەقەلا بۆ بەربوونی • لەوێوە بۆم نووسی : ئێمە ئێستا گەورەین ، بە ئارەزووو ڕەزامەندیی خۆمان ئەم ڕێگەی سەختیو ئازارەمان هەڵبژاردووە ، پێویست بەوە ناکات تۆ بۆ ئێمە بەم چەشنە خۆت بخەیتە ناخۆشییەوە • لە وەڵامدا بۆی نووسیم : « نە ئەبوو تۆ قسەی وا بکەیت ، چونکە ئەوەی بۆ تۆم دەکرد ، بۆ ئەوی نەکەم ، دەبێتە جیاوازی لە نێواتاندا ، پاشان هەندێك کەس لافی ئەوە لێئەدەن کە لە پێناوی میللەتێکدا ، یا لە پێناوی هەموو مرۆڤایەتیشدا فیداکاری دەکەن • تۆ تەنیا بەخشینی شەرەفی فیداکاری ، لە ڕێگەی مندالی خۆمدا بە من ڕەوا نابینی ؟ » •

١٤- لە وەڵامی فەرمانی شێخو نەویستنی ئەو پایەیەدا ئەم دوو دێڕەی نووسیوە :

من کە بازی بم چلۆن قازی ئەبم
شێت نەبم بەو حالە چۆن ڕازی ئەبم
من کە واعیز بم چلۆن تەرکی ئەکەم
حالو موستەقبەل وەکو مازی ئەبم

( تێبینی : مەبەس لە « بازی » سەر بە « باز » واتە شێخ عەبدولقادری گەیلانییە ) •

١٥- ئەو ئالآیە بوو کە دوو جار حاجی مەلا ڕەسووڵ ، بە جێگری کاك ئەحمەد ، دایە دەست شێخی نەمر ، یا بڵێین شێخ وای لا پەسند بوو لە دەستی ئەوی وەرگرێ • جارێك لە غەزای ڕووسی چار (قەیسەر)دا کە حاجی مەلا ڕەسووڵ خۆیو دوو کوڕی ( مەلا ئەحمەدو مەلا مەحموود ) تێدا بەشداربوونو جارێك لە چوونی شێخدا بۆ غەزای شوعەیبە •

١٦- بە داخەوە تا ئێستا هیچ کەسێ باسی ئەم کۆمەڵەی نەکردووە • من هەندێك لەو یادگارانەم لە بیر ماوە کە « سەفوەت » دەیگێڕایەوەو هەندێك لە بەشدارانیشی ماون • بە تایبەتی مامۆستا سەعید ناکام • زۆر پەسندە کە مێژوونووسەکانمان ڕووی تیشکی پێنووسیانی تێکەن •

١٧- « سەفوەت » هەر لە لوبنان کەوتبووە خوێندنەوەی هەندێك کتێبی پێشکەوتنخواز• کە هاتەوە باسی نووسینەکانی «عومەر فاخووری»و ئەوانی دەکرد • دیارە مامۆستا بەکر دەستی زۆری لەم ئاراستەکردنەدا هەبوو • بەڵام لەو ساڵانەدا هەر بە هۆی مەحموود فەهمیەوە دۆستایەتیی لەگەڵ مامۆستا ئەحمەد هەردیو ئەحمەد غەفووری نەمردا بەتین بوو • ئەم چەشنە دۆستایەتییە تا ناوەڕاستی ١٩٤٨ی خایاند ، تا کارەساتی فەلەستین ڕوویدا • هەڵوێستی « سەفوەت » لەم مەسەلەیەدا تەواو موسوڵمانانە بوو ، لەبەرئەوە تا ماوەیەك هەستو نەستی لە بەرەی چەپی ئەوساوە دوور کەوتەوە •

١٨- شاعیر ساڵی ١٩٥٦ بوو بە خەتیبی خانەقا ، بەڵام چەندین ساڵ پێش ئەوە ، کە خوالێخۆشبوو شێخ محێدینی سەید غەوسە خەتیبی سلێمانی بوو ( کە ئەویش شاعیرو نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزی کورد بوو ) ، لە کاتی سەفەردا خوتبە خوێندنەوەی بە سەفوەت دەسپارد ، ئەمیش زۆر جار خوتبەکەی دەکرد بە کوردی •

١٩ـ لەسەر گۆڕی « ئەمین زەکی » تەلقینیان پێسپارد • تەلقینەکەی کرد بە خوتبەیەکی تێکەڵ لە تەلقینی تەقلیدیو لە باسی ئاینو کوردایەتیو کۆمەڵایەتی ، بە کوردی • لە وەڵامی سەرساماندا دەیووت : تەلقین بۆ زیندووانی دەوری گۆڕەکەشە • لەبەر ئەوە دەبێ ئەو کەسانەی هاتبنە سەر گۆڕی ئەمین زەکی بەم جۆرە تەلقین بدرێن •

٢٠ـ ئەم بەرهەمەی جارێکیتر لـە مەهـاباد لەلایەن سـەیدیانەوە چاپکراوەتەوە • سەیر ئەوەیە سەییدیان پرسێکی بـە ئێمە نەکردووە هەرچەند کەسیش قانزاجی لەو نەویستووە • لەوەش سەیرتر ئەوەیە ئێمە هێشتا زرتو زیندوو ، کەچی ئەو نووسیویەتی : لە چاپدانەوەی بە دەست سەییدیانە •

٢١ـ ڕەنگە هەڵبژاردەی ئەم بەرهەمە ، لـە ڕووی ئەدەبیاتەوە بچێتە ناو بەرهەمی داستانەوە • شاعیر ئەمەی لە سەرەتای لاوێتیدا هۆنیوەتەوە، خوێنگەرمیی موسوڵمانیتیو حـەز بەوە کردن ، کـە هـەموو سەرچاوەکانی ئاین بنە کوردی وای لێکردووە خۆی بـەم کـارە فراوانەوە خەریك بکات ، بە ئومێدی ئەوەی لـە شەوانی رەمەزاندا ئەم باسی شەڕی ئیسلامە جێی خوێندنەوەی ئەوسای « شـانامە »ی ناو چایخانەکان بگرێتەوە •

٢٢ـ لە ڕاستیدا سەفوەت زیاد لە یەك چەشنە تەفسیری قورئانی هەیە •
لـە سـەرەتای مەلایەتییدا ( جزمی عەممە )و ( سـوورەتی بەقەرە )و ( ئالی عیمران )و ( مائیدە )ی تەفسیر کردووە • لە ساڵانی دوایی ژیانیدا هەر بەسـەر دوا چاپی قورئانی دائیرەی ئەوقافەوە ، زوربەی قورئانی پیرۆزی بەکورتی ، بە زمانی کوردی تەفسـیر کردوە •

٢٣ـ لە لاپەڕەی یەکەمی دووا نووسینەوەی ئەم بەرهەمەدا یاد پیرۆز شێخ نووریی شێخ بابە عەلیی تەکیە بە خەتی خۆی ئەم چەند دێڕە شیعرەی نووسیوەو مۆری کردووە ••

خزمەتێکی چاکە سـەفوەت کردت بۆ دنیاو و دین
غیرەتت کێشـاوە بۆ ئەم گولشـەنە ئـەی ئافەرین
لەفزی خۆشە ، مەعنەیی پڕ نوکتەیە سەر تا بـە پا
ئێمە کوردین لازمـە بەم پێشکەشە مەمنوون ببین

( نووری ) زۆر خۆش حالە بەم هۆنینەوەی ئەشعاری تۆ
زۆر لـە لامـان باشـە بۆیـە حـازری تەقریز ئەبین

٢٤- ئەم تێبینی‌یە بە ووتن ، لە کاتی ئـامـادە کردنی دیوانەکەدا دەربڕرا ، ئەمانەت ئەوەیە کە بدرێتە پاڵ خاوەنی .

٢٥- شاعیر لە منداڵی‌یەوە پێوەندیی لەگەڵ جیهانی شیعرو شـاعیراندا بووە . لە سەرەتای وەرگێڕانی گولسـتاندا هەندێ لـەو یادگارەی گێڕاوەتەوە . لە ڕووی زمانەوە دەیگێڕایەوە دەیووت :

سالی ١٩٢٠ کە ڕۆژنامەی « پێشـکەوتن » ، بڕیـاری موسابەقەیەکی دابوو بۆ شـیعرو نووسینی کوردیی پەتی‌و مەرجیش ئەوە بوو بەرهەمەکە ووشەی بێگانەی تێدا نەبێ . من لـە سەرەتادا بووم ، بەڵام تینم دایە خۆم‌و شتێکم نووسی . لە ئەنجامدا بەرهەمەکەم لەبەرئەوە درایە دوواوە ، چونکە ووشـەی « عەرد یا ئەرد »م بەکارهێنابوو . کـە لیژنـە بردیانـەوە سـەر ووشـەی « أرض »ی عەرەبی .

بەداخەوە ئەو بەرهەمەی شاعیرمان نەدۆزی‌یەوە .

٢٦- ئەم تێبینی‌یانە لە ووتنەوە خرانە سەر کاغەز .

٢٧- بڕوانە : ( د . عیزەدین مستەفا ڕەسـوول . کاکەی فەللاح . « پێشەکی » ، بەغدا ، ١٩٨٠ . ل ٦٣ ) .

٢٨- لێرەدا مەبەسم شیعرەکانی خۆیەتی‌و لە وەرگێڕانەکانی نادوێم .

٢٩- زۆر ئاسایی‌یە کە شاعیر لێرەدا باوکی بباتە ڕیزی ئەو شاعیرانە ، چونکە لە باوەشی ئەودا گوێچکەی بە ئەدەبیاتناسین ئاشنا بووە .

٣٠- ڕەنگە لە ژمارەکانی (ژین)و ( ژیان )دا شیعری بڵاوکراوەی هەبێت ، بەڵام بە داخەوە نەمانتوانی هەموو ئەو ژمارانە بگەڕێین .

٣١- لێرەدا دەبێ سوپاسی بێ پایانی دۆستی دڵسۆزمان شـــێخ ڕەووفی شێخ سەعیدی تەکیە بکەم ، کە وەفادارانەو دڵســـــۆزانە زوربەی کتێبەکانی لە فەوتانو دەست بەسەرداگرتن پاراست .



- ١ -

خەیاڵی عەشــقی هێند گەرمـە لـە سـەرما
لـــە زســــتانا نی‌یە بـاکم لـــە ســەرما
لـــە هـاوینـــا ئەوەنـد ســـاردە هەناسـەم
ئـەبـەد نـاکـــەم شـــوعووری تینی گەرما
ئەگەرچی گـەرمـە باســــی ئـەو ڕەقیبـە
لـــە کـەیـن‌و بـەینی ڕازا بێ خـەبـەر مـا
ڕووەو جـەنـنـەت ئـەڕۆن وا تیپی ڕەنـدان
شـوکور زاهیـد لـە نـاو بیری سـەقەر مـا
ئـەوی پـەیمـــانی دامێ‌و جێی نـەهـــانی
لـــە ڕاسـتم چـاوی هەڵنـایـە لـە شـەرما
چ زەوقی دیـوە ســۆفیی بزنـە ڕیشــــە
کـەوا هـەروا لـــە ڕیـزی بـــزن‌و مـەڕ مـا
ســـەرم ســـەرســـامە زاهید چەندە گێژە
لـە ڕەنگ‌و دەنگی تـۆ چۆن کوێرو کەڕ مـا
بڵێن بـەو زالمـە خوێـن خـوارە ســـەهوە
ئـەگـەر وا تێ‌ئـەگـا خوێنـم هـــەدەر مـا
سبەی وەك سەگ پەت ئەکرێ‌و دێتە مەیـدان
تەماشـــا چەندە پەسـت‌و قوڕبەســەر مـا
تەماشــــای نیکتەبـازیی عەشــقی من کەن
مەڵێن ( ســەفوەت ) لە عەشـقا بێ هونەر مـا

- ٢ -

## مـەدحو پاڕانەوە[1]

گـــەداوو ڕەندو قەلـەندەر لـە كۆیی شـەیخەینا
بـە كوێـری هـاتووم ئاســـــانە گـەر بیم یـنـا
دلـم نەخۆشــــە كــە ئێوەن تەبیبی حازیقی دڵ
نیـازمـەندی ئێوە هـەزاران ئەبوو،عەلی ســـــینا
چ‌مـە لـە عیسـایی مەریەم ، هەمە كە عیسایی كورد
غولامی مووســـایی كوردم ، بە مووسایی سینا[2]
بە نیو نیگاهی گۆشەی چاوی غەوسـەكەی ئەعزەم
بـە سـینن[3]و ســــالی منالی مەحەبەتم هێنـا
لـــە شـــاخو داخی سرۆچك بـە ناوی بەرزنجـە
بـە ناوی كـەعبـەیی كـورد كێ بینـایـەكی دانـا
دو شـــاهبازی سـیادەت دو بەنـدی جـەرگی برد
دو قـوتبو پیـری تـەریقـەت دو عـارفو دانـــا

(١) ئەم پارچەیە بۆ شێخ عیساو شێخ مووسای بەرزنجە نووسراوە ، بەڵام وا دیارە تەواو نەبووە . ( ع . م )
(٢) ئەم ( عیسا )و ( مووسا )یانە لەبێ بە ( عیسە )و ( مووسە ) بخوێنرێنەوە لەگەڵ بەكورتی ددان پێدانانی ( یی )ەكەی دوایاندا .
(٣) سین ، سن ، ساڵ . ( ع . م )

## موعەمما

## بە ناوی

## « مەحموود » [ بێخود ]

ـ ٣ ـ

موو لەسەر ئەووەلی دیدە وەکو تیری ئەسحاب
ڕۆحی مەحرووم ئەکوژێ ، جێگەیی ئەگرێ بە شیتاب[١]
ناوی ئەو زاتەیە پێویستە تەشریف بێنێ
با نە مەحرووم بێ لە ئەحباب و نە مەئیووس لە کەباب
منو کاکە حەسەنین[٢] واینە لە مەیدانی مەساف
بە فەساحەت بە بەلاغەت وەرە تۆو فەسلی خیتاب[٣]

(١) شیتاب ، بەپەلە ، بەخێرایی .
(٢) مەلا حەسەنی عەلاف .
(٣) فصل الخطاب . ( ع . م )

— ٤ —

شـــاهیدی عەشـــقیم هەیە دێوانەیی‌و ســەحرا نەوەرد
جێ نەما تیـا بســـرەوم شارو دێهاتو ، چۆڵو هــەرد
هێنــدە گریــام بـۆ بینایم نابینا بوو چــاوەکـــــەم
ســـا کەرەم فەرمووو لەبەر پێت بۆ بینایم تۆزو گــەرد
من ســـــەرم دانا لــە ڕێبـــازا کــە تـۆ پێی لێ بنێت
کــەوتــە ژێر پێی ئەو ڕەقیبە ، ئەی سەری خۆم دا لە بەرد
هەڵئەلــەرزم بـــەم چلەی هــاوینـــە مــن لــەم ژوورەدا
زەمهەریـرێــکە ئــەوەنـدەم هەڵکێشــــاوە ئاهی سەرد
هێنــدە تیــری گرتــە دڵ خــاڵخالــە مــەیلی یــاری‌یــە
دڵ ئــەکــاتــە مۆرە ، سـینەم چاك ئەکا بۆ تەختی نەرد[١]
پێم ئــەڵێ بەســـیەتی لافی عاشـــقی ، کــوا شاهیدت
نیمە شاهید غەیری لێوی ووشـــك‌و غەیرەز ڕوویی زەرد
چیم لــە تەڕپۆشی‌و لــە خـــۆ بـادانو کیــرو دەعیەیە
بێ نەوایی‌و ڕوتبــەیی حیشـــمەت لــە لای ئینـانی مەرد
دڵ بــە میحنــەت شــادمانە ( ســەفوەتــا ) بیستوومە من
خۆشــەویســـت‌و هەم‌نشـــینی ئاســـتانە ئەهلی دەرد

(١) نەرد ، یاریی تاوڵە .

## ٥

جیهـــان بێ‌کـام‌و بەدنـام‌و زەلیـل‌و بێ دەلیـــل‌و زار
جەفاکێش‌و جـگەرڕێش‌و حـەزین‌و عـاجـــزو بیمار
منم ســـەحرا نـەوەردو کۆە گـەردو غەرقی بەحری غەم
منم بێ‌بـاڵ‌و عەوداڵ‌و قەڵـەندەرواری شـارەو شـــار
فەلەك فووت‌کرد لـە شەمعم ، بۆچی تێکت‌دایـەوە جەمعم
پەرێشان حاڵ[1] لە هیجری گوڵ تەماشا چەرخی بەد ڕەفتار
وەتـەن باخێکی پڕ گوڵ تۆ ، غەزەل‌خوان چەشنی بلبل من
هوزار ئاسـا خۆش ئەلحانم بـە مینقاری قەڵـەم ئەشعار
وەها کەوتوومە بەر گێژی دەسی چەرخی فەلەك ئەمڕۆ[2]
نی‌یە ئیسراحەتم ئانێ گەهێ دەشـــت‌و گەهێ کۆســـار
فـەلـەك چیت دی لە من ئـاخر وەها تەفرو تونـات کردم
بلێ بۆچی منت کردە ســـوپەر بۆ تەعنەیی ئەغیـــار
ســـەبا هەسـتە بـە ئاهیســـتە بڕۆ تاکو ســـولەیمانی
ببـە[3] شـــەرحی دلی ســـەودا زەدەم بۆ خزمەتی دڵدار
( فقـل ما شـــــفت من حالي و ما جـاء علی بالي )
نـەمـا یـارایی گوفتـــارم ئـەتـۆ حـالم بکە ئیزهـــار
مولەققەب‌بووم بە (سەبری) هێندە سەبرم گرتەبەر سەبری[4]
دەڵێن بەحرێکی بێ پایانـە غوربەت لێم نەدی ئەقتـار[5]

(١) نوسخە ( دل ) . (٢) ئەمڕۆ . ن . جانا .
(٣) ببە : ن : بەرە .
(٤) ئەم نیو دێڕە لە نوسخەیەکدا بەم‌جۆرە نووســـراوە : بە جۆگەم زانی تێکەوتم کەچی ( سەفوەت ) ئەمێستاکە .
(٥) ئەقتار : کۆی قەترەیە ـ واتە : تنۆك .

تێبینی : دیارە ئەم پارچەیە زۆر کۆنەو بەرهەمی سەرەتای شاعیری‌بەتی کە هێشـــتا هەر ( سەبری )ی نووســـیووەو دوایی لەگەڵ ( سەفوەت ) نووسیندا ئەو نیو دێڕەشی گۆڕیوە .

— ٦ —

( یـا الهی خالق النفس و یـا بـاري البشـــــــــر )
نـۆ ڕەواقی چەشـــنی ئەم قەسرە لە تۆوە یەك ئەســـەر
تۆ کـــە ئەکبـــــەر خـالقیتو ئەحقـەری عـالـەم منم
چی لـــە مەدحی تـۆ بلێ ئـاخـــر منێکی قوڕبەســـەر
نوقمی دەریـــایی گونـاهـم ، پـەل ئەهـاوێژم هـەتـا
بێتـە دەســـتم دەستگیریێ وام لـە خنـکانو خەتـەر
گـەر لـە ڕۆژی ئاخیرەت لوتفت نەبێ خۆزگەم بە سەگ
ســـەگ ئەبێتە خاكو نابینێ عەزابو چەرمەســـەر[1]
چیت پەرستش کـەم کـە چەند سالێکە ئالوودەی گوناه
ئەی بە لەك[2] بـۆ تـۆ مەلەك گەردن کەچو بەستە کەمەر
ڕووم نی‌یە هاواری ( ئەحمەد ) کەم وە یا ئەسحابی ئـەو
چاری (سەفوەت) هیچ نەما ( لا تقنطوا )[3]ی وا کردەبەر
دێ لـــە دەرگانەت ئەوەستێ ڕوو ڕەشێکی چەشـنی من
گـەورەیی لایق بـە تۆیـە چەشنی سـەگ نایکەیتە دەر

★ ★ ★

(١) ن . ( بەس نی‌یە بۆ خۆی ئەبێتە خاكو نابدەن چەرمەسەر ) .
(٢) بە لەك ، لەك ـ سـەد هەزار ، واتە بە سەد هەزاران (ع) .
(٣) ئیشارەتە بۆ ئایەتی « قل یا عبادي الذین اسرفوا علی انفسهم لا تقنطوا من رحمة الله ، ان الله یغفر الذنوب جمیعا ، انه هو الغفور الرحیم » . ( الزمر ـ ٥٣ ) .

## ٧ بۆ ماسی ...(١)

ماسی‌یە بچکۆلـەی سپی‌و زەردو سـوور
ئەدرەوشـێتەوە بـە چەشـنی بلوور
ئـەی بەرگـەردنی سـپیت وەك كافوور
وا بەسـزمانیت یـا بوویی مـەغروور
سـەرکەشی جوانیت لـە خۆت ناوە موور

تـۆ موئنیسـی من ، من موئنیسـی تـۆم
ڕازی دڵ دادە منیش ڕازی خـۆم
من لـە سـەرنوێشت کرایە تەوقێ بـۆم
دووریی نیشـتمان خرایـە ئەسـتۆم
مەمرەو مـەژی بـم لـە نیشـتمان دوور

(١) کە شاعیر لە لوبنان نەخۆش بور ، دوو ماسیی سـووری بچکۆلەی کڕیبوو ، بۆ هاودەمیی خۆی لە ژوور سـەری خۆیەوە ، لـە ژووری نەخۆشخانەکەیدا دانابوو . ئەم شیعرانەی بۆ ئەو ماسی‌یانە نووسیبوو و هەر لەوێوە ناردبوی بۆ گۆڤاری گەلاوێژو لە ژمارە ١٠ی ساڵی ٤ دا ، ١٩٤٣ بلاوکرایەوە .

شاعیر کـە هاتەوە ، بەو ڕێگە درێژەی ئـەو کاتەدا ، کە دەبوو چەندین ئۆتۆمبیل‌و شەمەندەفەر بگۆڕێت‌و چەند شەو و چەند ڕۆژ بـە ڕێگەوە بێت ، ماسی‌یەکانی لە شەربەیەکدا گەیاندەوە سـلێمانی . ئێستاش لەبیرمە کـە خرانەوە سوراحی‌یەوەو خەڵك لایان سـەیر بوو ، چونکە ئەو چەشنە ماسی‌یە نەگەیشتبوونە لای ئێمە . لەو کەسـانەی بۆ بە خێر هاتنەوەی شاعیر هاتبوون ، ( بێکەس )و بەختیار زێوەر بوون ، پێکەوە هاتن ، بێکەس هەر لە تەنیشت ماسی‌یەکانەوە ، ڕاکشاد هەندێ دێڕی شیعرەکانی ( سـەفوەت )ی دەخوێندەوەو دەیووت :
- ئافەرم .. ئافەرم ... دەهێنن . جارێك بیری ئـەم شیعرانەم بـۆ جەواهیریی مەزن باس کرد ، دەیووت ، زۆر تازەیە ، نوێگەری‌یە .

ئەی تۆ ماسی‌یەکەم چۆن وا ڕەنگینی
بەکام ئاو ئەژیت وەها نەخشینی
دەست لە گەردنی کام نازەنینی
دڵشادی ڕوویی کام ماهـ جەبینی
ئەڵێی نەتدیوە دووریی شارەزوور

پاسوخی ماسیی بەستە زمانم
وتی ئەی ( سەفوەت ) موونیسی گیانم
بە ڕۆژو بە شەو هاوڕێی ژیانم
منیش وەکو تۆ دیلی لوبنانم
من لە شووشەدا تۆ خزاویە ژوور

تۆ وا مەزانە ئالی بەرگمە
نە بە خوا هەمووی خوێنی جەرگمە
فوارەی هەڵداوە لەو خەدەنگمە
دەری دایە دەر نزیک مەرگمە
لە دلما نی‌یە زەڕەیەک سروور

عالەم لە حالم سەری سووڕماوە
من بە قەد تۆزێ ئەو دەلیا ئاوە
لێی‌ئەخۆمەوە لە هەموو لاوە
بۆچی تینوێتیم هێشتا هەر ماوە
کام ئاگر سینەی کردم بە تەنوور

چ ووشکاتێکە وا نابێ پاراو
چ تینوێتی‌یەکە وا نابێ تێراو
لە سینەی منا بە دەلیایە ئاو
چ گڕپەیەکە وا گرتوویە تاو
کەژ ئەتوێتەوە دەسا یا سەبوور

کـــام ئـاگـر جـەرگی وەهـــا برژانـم
چ مـەنجـــەنیقێ هــــــەلی قـرچـانـم
چ گـرپـەو گـــڕێ دلی ســـــووتانـم
وەك قـەقنـەس دایـم ســــینه بوریـانـم
دلـم وەك دلت بـوو بـــه کــۆیی نوور

لـه نیشـــــتمانیش لـــەو نـاو دەلیـایـه
کـــه وێنـــەی نی‌یه لەم ســــەر دنیـایـه
ئـەهـاتم ، ئـەچـووم ، بـۆ هەموو لایـه
ئـەیـانووت خۆشـــــی وا لـــه دلیـایـه
ئەدرەوشـێتەوە وەکو شـــــوعلەی نوور

لـەوێش بـــه داخی نیشــــــتمانـەوە
جەرگ‌و دل وەهـا ئەســـــووتـانـەوە
کـــه ئـــەو دەلیـــایـه نـەیکوژانـەوە
ئـەو بـەحـــــره ئـاوە داینـەمرانـەوە
گـلاراوم بوو ســــــــەرو خوارو ژوور

ئادەمزاد ئەهـــات خۆی تیـا ئەکرد قووت
تیــــا ئەچنی‌یـەوە لوئـلوءو یـاقـووت
دوڕو مـــرواری‌و ئـەلماس‌و زمـــڕووت
منیش کەســـاس‌و خوارو ڕووت‌و قووت
وەکو ژێ کـەوان ئەبووم گـرژو کـووڕ

من وا بـه خـواری وا بــه کەســاسی
ئەمــــــوورامـەوە بـه بێ کراسی
زەمین نشــینان خوایـان نـەناسی
وەختێ ئـەهـاتـن بـۆ ڕاوە ماسی
پـاپـۆڕ پـڕ ئەکــرا ئەیـانکرد عوبـوور

دەنگ مەکـه دنیــا مەندۆق مەندۆقـە(٢)
سـەر زەوی حەشــرە پڕ تـەق و تـۆقـه
بــه تـائـك و فــڕۆك دراوە ئـابلۆقـه
بـه دەم گـوللەی تـۆپ گـەدا یـا دۆقـه
نـایمێنێ تـۆزێ بـۆ خـۆراکی موور

تێـر کـەی لــه برســی بووە ئـاگـادار
ســــا بەڵـکه تـۆزێ بیینن ئـازار
بـزانـن چیـیە کەســاسیی هــەژار
مـن و تـۆ بکــەن لــه دیلی ڕزگــار
خوا پەنای هـەژار ســـەرکەوێ بۆ ژوور



(٢) من دق' د'ق .. کورد بۆ گالتە دەیکەن بە ( مەندۆق مەندۆقە ) .

## یادێ[1]

## ٨

هەناسە هەڵسە لە لوبنانەوە بڕۆ دەم‌و دەس
هەتاکو شاری سولەیمانی لامەدە لای کەس
بچۆرە خزمەتی دوو قۆلە میرەکانی برام
بچۆرە لای گوڵی ڕەنگینی کۆرپەیی نەورەس
بەڵا لە دوورەوە ڕاوەستە کەس مەسووتێنە
بە گڕپەوو گڕەکەت با دڵم بسووتێ‌و بەس
بڵێ لەباتی من ئەو دەس بدا بە تاسەیی دڵ
دەسی ئەکاتە مل‌و ماچ ئەکا دەم‌و دەس
لە حاڵەتم گەر ئەپرسن بە ڕاستی دیلم
لە ژووری دێرێ بە ناوی مەسەح نزیك بەحەس
وەرە دە بەم ڕەمەزانە لە جێی تیلاوەت‌و بانگ
لە گوێت بێ قوڕەیی ناقووس‌و زیڕو هووڕی جەرەس !
لە جێی فریشتەیی یەزدانی ڕاهیبانی دێر
کڵاوی لەقلەقی‌یان وا لەسەر ئەڕۆن بە هەوەس
ئەمانە گەر بە هەزاران‌و گەر بە ملیۆن
خۆیان بە ناوی مەسیح دائەتێن بە قەولی قەس
بە کۆڵێ عیلمەوە کەوتوومە ژێر دەستی ماسێرێ[2]
کە ناکەسە لە کن ئەو کەس ، وەکوو کەسە ناکەس
بە ناوی دەرزیی هەوایی پەراسو و سینەم گشت
بە جۆرێ کونکونە وێنەی نییە بە غەیری قەفەس
برا ئەمانە بە هەر سوورەت هەر چڵۆنێ بوو

(١) ئەم پارچەیەش کاتی نەخۆشیی لوبنانی ووتراوە . دیارە پاش ئەوەی عەمەلیات کراوە .

(٢) ماسێر ـ خوشك ، یا خوشکە ، بە ستەر دەووترێت .

تەبیبە دڵ ڕەقەکەم وەك چیایە هاتە هەرەس
بە ناوی قەتعی عەسەب[٣] نیوە بەسمەڵی کردم
کە سەر بڕام و نەما هۆشم و قەتع بوو نەفەس
وەکوو خەیاڵێ ئەجووڵێمەوە ئەگێڕم چاو
لە شەش جیهەت کە ببینم یەکێ لە دۆست و کەس
بدا بە سینەوو سەردا کەوا بە ناکامی
جەنازەکەم ئەبەنە. مەقبەرەی ( سیمۆن )ی تەرەس[٤]
لە باتیی شێخ و مەلا ڕاهیبە بکا نوێژم
وەرە لە جوابی نەکیرا زوبان نەبێ ئەخرەس
لە دوای مەلایەتیی چەند ساڵە مردنت وا بێ
بیە بە هاوڕێیی گورگ و چەقەڵ سەگ و کەرگەس
بەلا شەماڵی خەیاڵی ویصاڵی ئێوە کە هات
حەیاتی کردەوە بەر وەك مەسیحی دادڕەس
نەمردم ئەم سەفەرەش چەرخی کۆنی دانە سواو
لە چارەیی ڕەشی ( سەفوەت ) گەلێکی کەی بێ هەس

(٣) قەتعی عەسەب ، دەمار بڕین ، جۆرە عەمەلیاتێکە ئەوسا بۆ نەخۆشی کە سیلی بێ دەکرا ، ئەو دەمارەی ملی کە بە ( تاوپەردە ـ حیجابی حاجز )ەوە یە لێی دەبڕرا .

(٤) لە نووسینەوەیەکی قەسیدەکەدا ئەم دێڕەش هەبوو :

ئەوەندە لانە زەبوونم کە خۆشی خۆشیمە
بە پێکەنینێ لە حاجی حەنیفەیی چەرکەس

( حاجی حەنیفە ، پیرەمێردێکی موسولمانی چەرکەس بووە لەو نەخۆشخانەیەدا لەگەڵ شاعیردا بووە ) .

خـۆزگـــه بـۆ زاتێ دڵێـکی بێ لـەگـەڵ خـالیق خـەریـك
بێ هیـوا بــەم کـائینـــاتو عـالـەمـە دوورو تـەریـك
خۆزگـه بـۆ زاتێ بـه تەنیـایی لـه ژێـر ئـەم گـوومـەزە
ژیـن بەرێتـه ســەر نەبێ تێکەڵ بـه کـەس دوورو نـزیـك
خـۆزگــــه بـۆ زاتێ حـەلیـم بێ وا کــــه نـەڕوانێتـه دوا
گــەر بـه سـەریا دەن بە بەرد و دار و پـاچ و بێڵ و پیـك
خـۆزگـــه بـۆ زاتێ لــــه تـەئریخـــا نـەزانێ چی بـووە
کێیە بســـــمارکو ئەلکســــەندەر وە یاخۆ فەردریـك
خۆزگـه بـۆ زاتێ وەحش بێتو لــــە دنیــــا بێخـەبـەر
تێ نـەگـا مـابـەینی ئـەمـریـکاوو ڕووسو تـورکو چیــك
خۆزگــــه بـۆ زاتێ نـەزانێ هیـچ لـــه هیـچ ئیشــێ نەگـا
پێ نـەزانێ ســیاسەتی بۆرەجوازیو بۆلشـــــــەویك
خۆزگـــه بـۆ زاتێ ئـەوەنـــدە بێ هیــوا بێو بێ ئـەمـــەڵ
جرتو فرتی ( جەبر )[1]و ( نووری )[2] نەیخەنە سەر فاڵو فیك
خۆزگــــه بـۆ زاتێ کــــه ئـازادە لــــە جەمعی ماســـیوا[3]
وەك وەحش تەنیـــا ئـەژی بێ یـارو بێهـاوڕێو شـــەریك
خۆزگــــه بـۆ زاتێ لەبـەریـا خەرقـەیێکی کـۆن و شــڕ
پێـکەوە نـەلـکێ مەگـەر بیداتـه بـەر دوورمـانو تیـك[4]
خۆزگـه بـۆ زاتێ وەکوو حـەیـوان بـه پووشی دەشت ئەژی
بێنـەزانێ تـامی گۆشـــــــتی بـەرخو ماسیو پۆڕو دیـك
خۆزگه بـۆ زاتێ لـه کونجێ دائەنیشـــــێ ڕوو لــــە حــەق
جــار بـه جـارێ بـانـگ ئـەکـا ( إرحمني يا خير المليك )

(١) ســالح جەبر .
(٢) نووری سەعید : لێرەدا ئیشارەتە بۆ ئەو کێشەیەی نێوان دوو حیزبە دروستکراوەکەی ئەم دوو نۆکەرە گەورەیەی ئیمپریالیزم لە ســالی ١٩٥٠ بە دوواوە کە هەندێ کەسی خەریککردبوو .
(٣) ماسیوا ، واتە ( غەیری خووا ) ، هەموو وجوود . (٤) تیك : تەتەڵ

## بــۆ حەپســـەخان[1]

— ١٠ —

زۆر دەمێــکە دوژمنــە ئــەم چەرخە بۆ ئــەهلی کــەماڵ
تایبەتی هـــەر کەس لـە کوردا هەڵکەوێ ئەینێتـە چاڵ
خورژمی بـارانی ئـەم زســـــتانـە خۆڕایی نـەبـوو
من زوو ئـەمزانی ئـەقـەومێ بێ ئەوەی پرســم هەواڵ
جۆشـــی باران بوو وە یـا گریەی فریشـــتەی ئاسمان
هەور بوو ئەیگرمان ، فەلەك[2] بوو یا ئەگریا نـاڵەناڵ
ئەم بەهارە وەك نەهـارە ڕووی زەمین ڕەش بێ کــەوا
بـەرگی ســـەوزی کردە بـەر وا پـڕ گلووکەو پڕ هەڵاڵ
من سـەهووم ، سەوزیی زەمین شـێوەی سیادەت دەرئەخا
عەکسی ڕووی ڕوڵەی رەسووڵە ڕووی زەمینی پێ بوو ئاڵ
هەقیـــە گـەر شـــاری سلێمانی خرۆشـــاوە هەتـا
ئەم سەری ئەم شـــارەو ئـەو سەر تا گەیشتە چەمچەماڵ
بـا هەتیـوان ، بێنەوایـان ، بێن بکەن شین‌و شـــەپۆڕ
قـوڕ بپێـون چـاکـە کـبەمدەســـــتانی بێئیش‌و بـەتاڵ
بـا یەکێ ڕاکـا هـەتـا مزگـەوتی گەورە بـانگ بکـات
کوێـرەکانی ، خاك بەسەردا کەن ، لێیان شێو وە حـاڵ
خـۆ زوبـــان نـاهێنێ بیلێم چی کـــە قەومـ اوە لێمان
مێشـــك ئەلەرزێنێ کە کـاتێ لێی ئـەکـــەم رو خەیاڵ

(١) حەبسـە خانی نەقیب .
(٢) فەلەك : ن ـ مەلەك .

سەیری کە پانیو درێژیی ئەم زەمینە سەر بەسەر<br>کۆستی وا هیچ قەومێ نەیدیوە لە هیچ تەئریخو سال

گەر ئەڵێم پێتان وەفاتی حەپسەخان ئالی نەقیب<br>زۆر ئەترسم وەرگەڕێ دەم یا زوبانم پێی بێ لال

ئەهلی ئەم شارە هەموویان حەپسەخان ئەولادی تۆن<br>تۆ ئەڵێی دەرچووم‌و نەمبوو من لە دنیادا منال

بۆ وەفاتی حەپسەخان ئاسن بێ دڵ ئەتوێتەوە<br>چۆن نەبرژێ ، چۆن نەقرچێ ، دڵ نەبێتە کۆی زوخال

ئەو [٣] تەئریخی بووە « حۆرییی قەسری بەهەشتییە »<br>١ ٣ ٧ ١<br>بۆ قیامەت بوو بە خانی حۆرییانی چاو کەژال



(٣) شاعیر لەسەر ئەم نیوە بەیتەی نووسیوە ١٣٧٢ واتە حەپسەخان لەو ساڵەی کۆچیدا فەوتی‌کردووە . هەرچۆنمان لێکدایەوە هەر ئەوە گونجا کە بە ڕێنووسی کۆن بنووسین : « حوریی قەصری بەهشتیە » کە ئەوەش ئەکاتە ١٣٧١ ، بەڵام لە نوسخەیەکی‌تردا نووسراوە : « عەقلی ئەڵێ [ جا باغی فیردەوسە ] کە تەئریخی وەفات » . بەپێی ئەم نیوەبەیتە رستەی ( جا باغی فیردەوسە ) ئەگەر بە ڕێنووسی کۆن بەم‌جۆرە بنووسرێ « جا باغی فردوسە » ، ئەکاتە ١٣٧٢ .

— ١١ —

لـەگـەڵ ئـەو بەڵمە ڕیشـــە دەس مەکە مـل
کـــە حۆری‌و گــا چلۆن ئەکرێن بـە هاومل
لـەگـەڵ ئـەو گورگنـە دان بـەردە پیســە
مـەبـە تۆ هەمنشــینی ئەی شـــڵ‌و مل
بـە چـاوی خـــۆم پـەری لای دێو ئەبینم
چلۆن تـاریـك نـەبێ چـاو و نـەکـا گـل
بـە یـادی تۆوە شـــــەو خۆ نیمە ئۆقرە
ئـەکـەم ئـەم دیو و ئـەو دیو و تـەپ‌و تـل
ســوپایی جوو و فەرەنگ ، ئینگلیزی ماتـەم
هوجوومیـان بردە ســـــەر سیناکەیی دڵ[1]
مەیـانڕێـژە دوو چـاوی خـــۆت کــەژاڵن
لـەلام حـەیفـە بگـاتــە چـاوی تـۆ کـل
بە شەو ، بۆیێ لـە شـەوبۆی زولفی تۆ کەم
ئیتر چیمە لـــە ڕێحـانـەو لـــە ســـونبول
دوو چـاوی ڕەش کەژاڵی دوو ســـــتارەت
گـەلێ حەیفە کـە تێکەلیان ئـەکـەی گـل[2]
نیـیـە چـــاری دڵی مـەجنـــوونی لـەیلا
بـــە خـــۆڕایی خـەریـکە ئینـو نـەوفـل

(١) دیارە ئەم شیعرانە پاش سالی ١٩٥٦ نووسراوە ، لێرەدا تەشبیهی خەم کراوە بە هێرشە سێ قوولی‌یەکەی سەر گەلی میسر ، کە ئەویش کراوە بە دڵ .

(٢) گل ، بە مانا خۆڵ‌و بە مانا ( کل ) یا ( کحل )یش دێت .

## ١٢

قوربـانـی چاوی پڕ لە غەمـزەو زولـفـی سیـاهـت بم
حەیـرانـی لێـوی پڕ لە خەنـدەو تەرفـی کولاهـت بم
بۆ حالـی دڵ نەزەر کە تۆ لە زولـفـە پەشێـوەکـەت
بۆ زامـی جەرگ سینـە فیـدایـی نیـم نیـگـاهـت بم

## ١٣

چیت ئەوێ لەم خەڵکە چی داوا ئەکەی
عالـەمێ یەکـسـەر وەها گومڕا ئەکەی
عـەبـدە مەیلت بێ ، ئەبێتـە ئـەولیـا
سـەد هەزاران کوێرو نا بینـا ئەکەی
سەر لەسەر ئەڕژێ ئەتێن بێ شێوی شەو
سەد هەزارانو یەکێ پاشـا ئەکەی
خۆت لـە قـالبـدا وەهات دارشـتووە
سـەفوەتی بێچارە بۆ ڕیسوا ئەکـەی

## حالی مەلا ...[1]

۱٤

سـبا لـە موخلیسـەوە وەرگرە ، بگەرە جێ پـەیام
بچۆرە خزمەتی گـەورەم مـودیـری عـالی مـەقـام
بـە سـەد خشـووعو ئەدەب عەرزی کە لە باتی فـەقیر
دوعـایی حـورمـەتو ئیقبـالو حەشـمەتی بـە دەوام
لـە پـاش ئـەمـانـە حیـکایـاتی بـۆ بکە بێ غـەش
تـەلاشـە ، وەقتی مەعاشە ، نزیکە قەسـدو مـەرام
خەریکی دەوروخولن ، سوورِ ئەخـۆن وەکو بەرداش
یەکێ بـە نـاوی مەشـیخەت ، یەکێ ئەبێتـە ئیمـام
یـەکێ موعینی ئـەوێ بـۆ ئیمـانـەیی شـەخـی
بـە لافی حاتـەمی پـارەی ئـەوێ لـە بـۆ ئیتمـام
یەکێ بـە مێزەری گـەورە ، یەکێ بـە سـەوزی زل
یەکێ بـە ڕیشـی درێـژو بـە چـەرخی نوتقو کـەلام
بـە عـەرزوحـالو مـەزابیت بـە زەبتو بێ زەبتی[2]
بـە سـەد ڕجاو و تەشەبیوس[3] ، بە خزمو خاسو بە عام
بـەلا فـەقیـری دوعاگـۆ بـە بێ ئەمـانـە هەموو
نیـیە وەسـیلەوو مەئوامو نیمە پشـتو پـەنـام
ئومێد ئەکەم کـە لـە خاتر بـەدەر نەکـەن سـەفوەت
بلێ بـە لوتفی سـەعادەتمەئابی تـۆ بـە هیـوام

(۱) حالی مەلای کورد بە دەست بێ دەرامەتیو بێ مەعاشییەوە زۆر ناخۆش بوو و کەرەسەی زۆر حیکایەت بوو . ئەم پارچەیە بەشێک لەو مێژووە دەگێڕێتەوە ، بە خەتو چەشنی کاغەزەکەدا دیارە کە لە سـەرەتای سالانی سیدا نووسراوە .

(۲) مضابط : جەمعی مەزبەتە . ضبط : ضبطی .

(۳) تشبث : هەوڵو تەقەلا .

دولبـەرا تاکەی بنـالم دەم بـە دەم هـــەر سوبحو شـام
بۆچی ناپرسی لــە حالـم خۆشـــەویستی خۆش کەلام
خۆشـــەویستی خۆش کەلامی شـــافیعی ڕۆژی جەزامی
هەمنشـــــینی لای خودامی ، تو خودا مەیلێ بـە لام
تو خودا تۆ واوە مەیلێ ، بوو بە مەجنوون ، شێتی لەیلێ
گێژو عـەودالی دوجەیلێ ، بـۆ بـــە خـــۆ نـایەیتـە لام
گەر بە خۆ تۆم بێتە لایە ، ئەبمە سـولتان وەك هومایـە
ئەبمە نوور ، عەینی چرایە ، ســـــەیریکە چەند بێ چـرام
بێ چرا عەینی زەلامم[٢] ، بگرە دەســـتم ، ئـەی مەرامم
بێکەســـم ، یاری خەرامم ، تۆ لـە جێی بـابو بـرام
تـۆ لـە جێی ئیخوانو بابم ، زیاتری ، بـە خوا فیـداتم
ســینە قـەفەس ، دڵ کەبابم ، مەلجەئی ڕۆژی جـەزام
مەلجەئی ڕۆژی جـەزایـە ، کەس بـە کاری ئێمە نـایـە
غەیری ئەحمەد لـەو هەرایە ، ئەی خودا چی بێ ســـزام
چیم سزابێ ، لـەو هەرایە ، ڕۆژی حەشرەو چی جـەزایـە
ڕووڕەشی وەك من فـەنـایـە ، بێ نمـازو بێ ســیام[٣]
گـەرچی بێ ڕۆژوو و نمازم ، سینە بوریان جان گودازم
خۆ بـە ئەحمەد زۆر ئەنـازم ، بچمە نـاو داروســـەلام
( ســـەفوەتا ) جێگەم ســەلامە ، شـافعێکی وا پەنامە
بۆ نەجاتم لـەو مەقامـە ، بێ حیـــــسابو بێ کـەلام

(١) دێری یەکەمی ئەم پارچەیەو هونەرە شیعرییەکەی چۆتەوە سەر پارچەیەکی ئەحمەدی کۆر کە بەم دێرە دەست پێدەکات :

**دولبەرا دایم دەنالم دەمبەدەم شامو ســـەحەر**
**جارێ ناپرسی لە حالم چاو عوفابی خۆش خەبەر**

(٢) زەلام : ظلام ، تاریکی .
(٣) صـیام : ڕۆژوو .

## قـوربـانی

### ١٦

ووتم وێڵێ قومێ ئـاوم لــه ئـاوی زیندەگـانیی تـۆ
ووتی ســـەیرێ لـه ژێر تاریکیی گیسووما زەنەخدانم[١]

ووتم قوربـان ئەڵێن تـۆ خـاوەنی دوو ڕیـزە مـرواریت
ووتی شـێتە تەماشـــــای کـە بریقەی هەر دوو لادانم

ووتم گیـانـه لـه باغچەی ڕوویی تۆ غونچه ( ••••• )
ووتی ئەیزانی ســـــەیریکه ، بـه ووردی لێوی خەندانم

ووتم دولبـــەر ، یەکێکی تۆ ، دوو شمشێری برۆ بۆچی
ووتی شمشێرێ بەش نـاکـا ئەوەنـدە زۆرە قـوربـــانم

ووتم قوربـانـه وا قوربـان ، بەشی ئێمەش هەیە ئـاخـۆ
ووتی قوربانی ئەو قوربانه زۆرن ، تۆش به[٢] قوربـــانم



(١) چالی چەناگە .
(٢) بــه : ببــه .

## ١٧

پەژموردەو ئالوودەیی غـەم ، دوور لــە وەتـەن خــۆم
پەرپووت بـەدەن ، ڕووت‌و حـەزین ، غەرقی میحەن خۆم
وەك بـولبــولێ شـــــەیـدا بێ ئەگریێم‌و ئـەنـالـم
گریــان‌و فوغـان ، زارو زەلیل دوور لـە چەمەن خـۆم
بێ ڕوویی تـۆ ئـەی یـاری وەفـــاداری جـەفـــاکێش
ئەفنەس دڵ‌و بوریان جگەر ، ئـاگـر لـە بـەدەن خــۆم
هـاتـە هەیەجان لەشـــکری غـەم ، سـوارەوو پیادە
بۆ کیشوەری دڵ وای بـە بێ خەیلی شـــکەن خـۆم
تـەن خەستەیی خاشـــاك‌و دڕو و خـاری مـەلامـەت
مەحرووومی ویســـالی گوڵ‌و ڕێحـان‌و سـەمەن خـۆم
کـەس حـالی بـە حالی منی بێچـــارە نـەبێ قــەت
دوورکـەوتـەیی دێوانـەیی نیگار لــە خوتـەن[1] خـۆم
( سەفوەت ) وەرە بگری بلێ هـــەر ئـان ، شەو و ڕۆژ
پەژموردەو ئالوودەیی غـەم ، دوور لـە وەتـەن خــۆم

(١) دەشتی خوتەن ، لە چین .

پەرچەمی ڕێحسانەیی بۆن خۆشی تۆ تا بۆ نەکەم
شەرتە سەد سونبول ، قەرەنفل ؛ یا خو شەوبۆ بۆ نەکەم
هەر سەری مانگێ کە قەوسی مانگی یەك شەو[١] دەرکەوێ
خۆشی لەو مانگە نەبینم یادی ئەبرۆی تۆ نەکەم
سەر لە ڕێگەی نیشتمان ڕۆیشتنا سەربەرزی یە
بۆ سەرێ لەو ڕێیە بڕوا عەهد بێ ڕۆڕۆ نەکەم
خۆت ئەزانی چەند بریندارم ؛ بەئازارم . وەلێ
قەولێکەو کردوومە بۆ تۆ ئای و ئۆف و ئۆ نەکەم
با من و تۆ ڕێ کەوین چیمە لە عوسبەو موئتەمەر
شەرتە ئیشی تۆ حەوالەی سان فەرانسیسکۆ[٢] نەکەم
بەردەسی بێگانەو و بەد ناو و ڕیسوا بم ئەگەر
حەز لە سەربەستی لە بەردەستی ، لە دەستی خۆ نەکەم
تا سولەیمانیم بێ زەلم و تەوێلەو سەرچنار
ئارەزووی واشەتن و یا لەندەن و مۆسکۆ نەکەم

(١) ئەم دێرە بیردەکەی لە شیعرێکی مەولەوی دەچێ .
(٢) سان فرانسیسکۆ ـ ناوی بەندەرێکە لەسەر باسیفیك لە کالیفۆرنیا ( ئەمەریکا ) . باش جەنگی دووەمی جیهان کۆنگرەی ئاشتی ی تێدا گیرا . ئەمە مێژووی نووسینی ئەم شیعرانەمان بۆ دەردەخات .

## ١٩

زستانە ، گوڵ نەماوە ، نیگارا ، لە ناو چەمەن
بێبەرگ‌و ڕووت‌و قووتە سەروو داری نارەوەن
بولبول خزاوەتە کونو قوژبن بە شینەوە
قومری ، سەیر کە ئەگری لە هیجرانی یاسەمەن
کوڵان پڕی لە بەفرە ، مەپرسە لە دەشت‌و کێو
پەردەی سپی بە ڕوویەوە بەڵکو هەموو بەدەن

## ٢٠

ڕۆژی جەژنی نەسرە ، عالەم وا لە خۆشی‌و هەڵپەڕین
بۆ نەجات‌و ڕستگاریی قەتڵ‌و نەهب‌و سەربڕین
ئاسمان بۆ ئێمە هەوری ماتەمی هێنا بە تاو
سینەیی قرچاو جەرگ‌و دڵ بە ئازارەو برین ...[1]

(١) ئەم دوو دێڕە لە پشتی نامەیەکدا نووسرابوو کە لە ڕۆژی ٤/٥/١٩٤٥دا لەلایەن دۆستی نزیکی شاعیر . مەحموود ئەحمەدی هەمەوەندەوە نێررا بوو . نامەکە پێوەندیی بەم دێڕانەوە نی‌یە . هەر مێژووی نووسینەکە دەردەخا کە ڕۆژی سەرکەوتنە بەسەر فاشیزما . هەر پاش ئەم دوو دێڕە سەرەتای نیو دێڕێك هەیە کە نووسراوە « بۆ وەفاتی عەبدوررەحمان ... » ئیتر دیارە ئەمە سەرەتای قەسیدەیەکی شبنە یا تەواو نەکراوە یا ڕەشنووسەکەی کەوتۆتە شوێنێکی ترەوە‌و وونبووە .

## ٢١

نـە حەیا ماوە ، نـە دیـن ، نـە ئیمان[١]
گشـــــتی بـار کـرا بـرا بە تالان
بـۆ لـە بیرتان چوو ، کوشـتاری لاوان

وەفدی کوردسـتان ، میللەت فرۆشـان
هـەرزە وەکیلی شـــاری خامۆشـــان

وەفـدی لیواکـان گشـــتی ڕێکخرا
هـەر کەس بـە پێویـست دیاریی بۆ کرا
ئێوەیش لازمن بـۆ دەســـــت ئومەرا

دەســکێ لەو گوڵەی باغەکەی ســەرا
کـــەوا بـە خـــوێنی لاوان ئـــاو درا

(١) لە بارچە کاغەزێکدا بە خەتی شاعیر خۆی لەخمیـــــی ئەم دوو دێڕەی قەسیدەکەی پیرەمێردم دۆزیەوە ، بۆ ئەوانی تری گەڕام دەســـتم نەکەوت . ڕەنگە هەر تەواوی نەکردبێ . بەڵام لەبەر ئەوەی شـتەکە لە خۆیدا هەڵوێسـتێک نیشان دەدات ، وا بـــە تەواو نەکراوی بڵاوم کردەوە . ( ع )

## ٢٢ لوبنانو كوردستان[1]

لـه قەتعەی ئاسیا ئیمڕۆکە بۆ ئیسراحەتی ئینسان
بەهەشتی سەر زەمینە دیمەنی سەر شاخەکەی لوبنان
لە هەرلا دێن بە دڵشادی لە لوبنانا ئەکەن سەیران
لە بن داری سنەوبەر سەزو و عەرعەر وەختی هاوینان

بەڵا ئاگاتە تۆ وەڵڵاهی ئەی کوێستانی کوردستان
دەسا چیبکەین نییە خۆ خزمەتت وەك جێگەوو شوێنان

چیای لوبنان بەلی بەرزە ، لە هەر لا سەیر ئەکەی سەوزە
تەڕو پاراو و پڕ ئاوە ، چ ئاوێکە ، وەکو تەرزە
لە هەر پەستیو نشێوێدا ، لە هەر جێیە کەوا بەرزە
هەموو لا باخو باخاتە ، بیناو و کۆشکی سەد تەرزە

بەڵا ئاگاتە تۆ وەڵڵاهی ئەی کوێستانی کوردستان
لێلایم دایە کوانێ خزمەتت وەك جێگەوو شوێنان

لە بەرزی یا لە نزمیدا سەراسەر جادە قیرتاوە
خەتی ئاسن وەکو ڕشتە ، لەسەر ئەو شاخە کێشراوە
هەموو ڕێ ئەمبەرو ئەوبەر بە ڕیزە دارە وەستاوە
لەسەر ئەم ڕێبوارانە چ نازك چەتری هەڵداوە

بەڵا ئاگاتە تۆ وەڵڵاهی ئەی کوێستانی کوردستان
دەسا چیبکەین نییە خۆ خزمەتت وەك جێگەو شوێنان

(١) ئەم پارچەیەش ساڵی ١٩٤٢ لە لوبنان نووسراوەو لە ژمارە ٨ی ساڵی ١٩٤٢ی گۆڤاری « گەلاوێژ »دا بڵاوکراوەتەوە .

ئەترسم ووشکە سۆفی لێم بڕەنجێ ئەو لە حەی[٢] دووره
بلێم لوبنـان نموونـەی جەنەتـە پـڕ قەسرو پـڕ حووره
بـە شوعلەی کارەبـا گشتی مونەووەر کێوەکـەی تووره
گلۆپی یـەك لەسەر یەك سەیر ئەکەی نووری عەلا نووره

بـەڵا ئاگاتـە تـۆ وەڵلاهی ئەی کوێستانی کوردستان
لێلاییم دایـە کوانێ خزمەتت وەك جێگەوو شـوێنان

بەڵێ لوبنـان بـە مەشـهووری چیایی خۆشی دونیایـە
بـە ڕوونیو ڕۆشـنی دەریای سپیشی وا لـە بندایـە
بـە ڕۆژ دەلیایەکی زیوە ، تەماشـاکەی لـە هـەر لایـە
نزیـك ئێـوارە ئاڵتوونـە ، کـە تۆزێ ڕۆژی بـۆ دایـە

بـەڵا ئاگاتـە تـۆ وەڵلاهی ئەی کوێستانی کوردستان
دەسـا چیبکەین نی‌یە خۆ خزمەتت وەك جێگەوو شوێنان

هـەموو سـەیرانـگەهی ئێمە تـەبیعیو ئیشی یەزدانـە
ئەمانـەی ئێرە گشـتی سنعەتی . دەسکردی ئینسـانـە
دوو سـەد سـاڵە خەریکن تـا بووە بەم کێوی لوبنانـە
سـوفارو عالیەو بەحنەس . وە یا ئەشتوورە ، حومانـە[٣]

بـەڵا ئاگاتـە تـۆ وەڵلاهی ئەی کوێستانی کوردستان
کوێرایی‌م دایە کوانێ خزمەتت وەك جێگەوو شـوێنان

---

(٢) لە دەسـتنووسێکدا بە « حەق » نووسرابوو . بەڵام لە چاپـەکەدا بووە بە « حەی » . دیارە مانای هەردووکیان هـەر یەکەو . بۆ بەرووەردگـار دەچێنەوە . بەڵام ووشـەی « حەی » لە مەیدانی تەریقەتدا بۆ لایەکی ترمان دەبا . بە تایبەتی کە بەرامبەر بە ووشکە سۆفی ڕاگیراوە .

(٣) هاوینە هەواری لوبنانن .

له دووریی داری‌زەردە[4] لێوی ووشك‌و گۆنەیی زەردم
لە بن هێلانە قەل[5] ، گەر بیر ئەکەم خۆ سەد قەڵو بەردم
تەمی سەر پیرە[6] (سەفوەت) خۆ هەناسەو ئاهەکەی سەردم
تەیب لوبنـانی دانـا بـۆ دەوایی سـنگی پڕ دەردم

بـەڵا ئاگاتـە تـۆ وەڵلاهی ئەی کویـسـتانی کوردسـتان
بڵێین چی سـا نی‌یە خۆ خزمەتت وەك جێگەوو شـوێنان



(4) داری زەرد : قەرەداغ .

(5) هێلانە قەل : جێگەیەکە بە زۆرر ئەو چیایەوە کە گوندی « دێلێژە »ی قەرەداغی بە قەد باڵەوەیە . ئەو گوندەش مەڵبەندی بـاو و بـاپـیری شاعیرە . ( قەلو بەرد ) لەیارییەکی منـداڵاندا هیچ بـە دەسـتەوە نەمـانـیە .

(6) پیرەمەگروون ، یا ( سـەرپیر )ی هەورامان .

## ٢٣

لە دونیا شاعیران ئەهلی کەمالن
ئەوانن خاوەنی فیکرو خەیالن
بەیانی حالی عالەم ئێوە ئەیکەن
بەلێ ئاوێنەیێکی بێ زەوالن
دەبۆ ئەم عەسرە فەرموون شەرحی حالێ
لە حالی ئەهلی ئیمرۆ بۆچی لالن
ئەلێن عەسرێکی نوورە عەسری بیستەم
لە غەم ئەی بۆچی عالەم لاڵو پالن
لە فێڵو زولمو زۆرا دەولەمەندن
لە ڕاستیو چاکەکردن دەست بەتالن
لە علمو سنعەتا کەوتوونە ئەوپەڕ
بە تەیارە کە دێن خاوەندی بالن
بە سەدها تەنی ئاسن لەم سەمایە
وەها زوو دێن دەچن چەشنی شەمالن[1]

(١) دیارە ئەم قەسیدەیە تەواو نەبووە . ( ع . م )

## شین[1] ...

## ٢٤

دل برینـدارم لە هیجری واعیزی دلسۆزی دین
عالەمی ئیسلامی کوردی بۆی بووە ئەمرۆ حەزین
بۆ تەسەللا هاتیفێ فەرمووی خیتابی پێ‌کرا
بێش وەفاتی خۆی بە سالێ ( وادخلوها خالدین )
١٣٤٦ ١ ١٣٤٧

(١) ئەم چوارینە سالی ١٩٢٧ نووسراوە ، دیارە شاعیر بۆ مەرگی باوکی ، حاجی مەلا ڕەسوولی دیلێژەی نووسیبووە کە لە ٣ی ربیع الاول ١٣٤٦. یا ٣١ی ئابی ١٩٢٧دا کۆچی کردووە .

دلـم حەقیێتی گــەر شین کا ئەزانی تـەیـری لاهووته

پـەڕو بالی ســوتاوه کەوتووه لـەم خاکی ناســـووته

گــەدای بەردەرگەیی تۆ بم ، شەهەنشـــاهی زەمینم من

لـەلام تەختی شەهەنشـــاهی بە وێنەی تەختو تابووتـە

لە لای عاقـڵ هەژاره گــەرچی ببێ خەزنـەکەی قاروون

لـە عەشـــقا هەرچی بێبەش بێ لە دنیـاو دینی نابووتـە

ووتم ســـــۆفی ئەزانم بۆچی تۆ وا ماتو بێدەنگی

ووتی دەروێش ئـەزانـم بۆچی دایم زیکری یـا هووتـە

بـە یەك یەك تاکـو ئێســـتا تیرت هاویشتە دلی عاشـــق

بـە جووت تیـرم ئەهـاوێتێ ، دەزانم بـۆ دلـم جووتـە

لـە نـازا بوو کـە ئەیپۆشی لیباسی سوندوس ، ئیستەبرەق

لـە شەوقی ڕووتە وا سووتاوه ئیســتا ڕووتو پەڕپووتە

چ کاســە سەر کەساسە دڵ ، چ بێ هۆشە لـە لام وایـە

لـە ســـیحری ســامیریدایە دوچـاری چاوی جادووتە

ئەیێتە بولبـولێ گــاهێ لـــە بۆ ئـەو بـاخی ڕوخساره

مەکـە مەنعی لـە ســـووتان ئەمڕۆ پەروانـەیی ڕووتـە

بە پەرچەم باوەشێنی ڕووی ئەکا تا لێی نەنیشێ مێش
ئەگەر مێشێ لە ڕووت نیشێ لە قەدرا خالی هیندووتە

ڕەوانە تۆ لەسەر خوانت هەیە هەر جۆرە خۆراکێ
شەرابی من کە خوێناوە دڵی برژاوی خۆم قووتە

محمد علي خضر

لە وەعدی یەك لەسەر یەك بێ ئەساست دڵ کە نارەنجێ
ئەزانێ وەعدی بێ جێ پیشەتە تۆ هەر ئەمە خووتە

لە مانگی چواردە دوێ شەو تێفکریم ڕووتم بە دڵدا هات
هیلالی یەکشەوە کاتێ ئەبینم چەشنی ئەبرووتە

تەماشاکە لە دانەی خالی ڕووتو داوی گیسوویی
ئەوەی مونکیر بە باسی سیحرەکەی هارووتو مارووتە

دزی بازاڕی عەشقە دڵ ، دەبۆیە ئەمری حەپست دا
لە زینـدانی چەناگەتداو کەلەپچەی موویی گیسووتە

لە ڕیزی ئەو ڕەقیبە ( سەفوەت )ی بێچارە ڕامەگرە
کە ئینسان لایقی عەشقە نەوەك هاومل بە گاجووتە

## ٢٦ — سەفوەتی تازە بیمار

سەیری کە دڵ غەمی لە سەر بارە
سەرچناری سەرم کە ئاودارە
دوو دیدەی بەکرەجۆو ئاوبارە
بۆ کەساسیی وولاتی بێچارە
دەم تەماشاکە پڕ لە هاوارە

دێتە خوارێ بە لێزمە ئەسرینی
بۆ زەبوونیی وولاتو بۆ ژینی
میللەتم هێند کەساسە نەبینی
وا لەژێر دەستو پێ نەما تینی
چبڵێم گەورەکانی بێکارە !

بەسیەتی گەورەیی بنێ لاوە
گەورەیی ئێوە چاوەوو ڕاوە[1]
کۆششێ ، هۆزەکەت بەجێماوە
تاکو تۆزێ هەناسەیێ ماوە
یەکیەتی ، دۆستی مەدەدکارە[2]

(١) نوسخە : دانەو داوە .
(٢) نوسخە : ووردە کارە .

دوشمنی تیرەکەت ، بە دۆست مەگرە
بە قـــەی من بکە وەرە مەمـرە
خوانی بێگانـە قـەت مـەخۆ زەهـرە
بـە ووتەی لووسی ئەو مەخۆ تەفـرە
زاهیرەن ماســـی باتینـەن مـارە

دەس لە دەس ، دەم بنێنە نـاوی دەم
زامی ئـەم خاکـە بـا بکەین مەرهەم
شـــادی بـا بێتو لا بچێ مـاتـەم
دەرکەوێ خاکی کوردە بـاغی ئیرەم
جەنـنـەتی ســـەر زەمینە ، گولزارە



٢٧

## له ئاهەنگی
## یادی بیستەمین
##ساڵەی ( ژیـــن )دا

لـــه بـازاڕی ئـەدەبـــــدا نیمە مـایــــە
لـەگـــەڵ پۆلی ئەدیــــــان ێمه کـایــە
بـەڵا ئیحســــــاسی ئێوه زەوقی بەخشـــی
ئەوەندە پێی بپرســـــــــم لـەم هـەرایـە
چی‌یە ؟ کۆبوونـەوەی ئـەم شـــــاعیرانـە
عموومی وا لـە کەیفو جونبوشـــــــایە
یەکێ وەك بولبولـەو بـۆ گــوڵ ئەخوێنێ
یــەکێ پـــەروانـــەیی دەوری چـــرایـــە
نیـــاری نەسر ئەکەن پێشــکەش بە کۆمـەڵ
خـەریـکی هۆننـــەوەی نـەزمن لـــەلایــە
بـەڕیـز دانیشـــتوون ئەشـــرافی کـوردان
لـە هـەر یـەك سـەیر ئەکەی وێنەی برایـە
ئەبێ ئـەم بەزمە خۆشـــــە موژدەیــەك بێ
لـە موژدەی ( ژین ) کـە بۆ کوردان هیوایـە
بـەڵێ وا جەژنی بیســـــتەم سـالی ژینـە
کـــەوا ڕۆژنـامـەیێـکی پــڕ زیـــایـە[1]

(١) زیا ، ضیاء ، ڕووناکی .

زیاو[2]و نووری ڕۆژی بەختی کوردە
هەزاران جەژنو شایی بۆ ڕەوایە
دوو پەڕەی پڕ لە بەندو نیکتەبازی
سەراپا حیکمەتە هەرچی تێدایە
بە شێوەو شکلی نووسین ؛ ژینی شیرین
لە ناو ڕۆژنامەکان خاوەن بەهایە
هونەر بۆ پیرەمێردی پیرە مەردە
لەگەڵ ئەم حاڵەتە لەم سەیرەدایە
ئەدیبو نووسەرو زاناو بوێژە
سیاسیو خاوەنی عەقڵو وەفایە
جەوانە هیممەتی ، لاوە دەماغی
لە هۆنینی شیعر ، تەبعی ڕەهایە
بە سەربەستی ئەنووسێ ، چی ئەنووسێ
ئەوەن بێ باکو پاکو بێ ڕیایە
دوو سەد لاوی حەپۆلەی بێ دەمو پل
لە بۆ ئەو پیرە شایانی فیدایە
هیوای بەرزیو بڵندیی نیشتمانە
قەڵەم بۆ مەردی وا شیری غەزایە
ئەڵێ ( سەفوەت ) بژی ئەم پیرەمێردە
هەموو ئامین بکەن بۆ ئەم دوعایە

ژین ـ ژمارە ( ٨١٩ ) ٧ی شوباتی ١٩٤٦

(٢) زیا . ضیاء ، ڕووناکی .

## ٢٨

چەند خۆشە موســـڵ ، کاکە مەلا[1] ، پڕ لـــە سروورە
ســـــەیرانـە ، وەرە ، میحنـــەتی دەورانی لیٚدوورە
شــــەو ڕۆژە لەبـەر بـەرقی ئـەلـەتریـكو چراخـــان
هــەر لایـە تەماشـــاکـەی ئـەڵێی قوببـــەیی نوورە
گەهـ مەنزەرەو و گەهـ قەدەحی گویٚ شـــەتو جیسری
یـایلیو ئـۆتـۆمبێـلی مـەکـە بەحـــــــی چ زۆرە[2]
مادامــە کــــە دێـن تیٚئـەپـەڕن بـاســـی چلۆن کـەم
ئـەم گـەردنـە بیٚ گـــەردە کـــە وەك جامی بلوورە
ئـەم مـاهـ ڕوخـانـە ؛ کــە ئـەڵێی حـووری جیـنـان
پووزی خڕو قۆلی ســپیو گۆنـەیی ســــــــوورە

(١) لە کۆنترین نووسینەوەی ئەم پارچەیەدا ، شاعیر نووسیوویەتی : لـە ٦ی ( ربیع الاول )ی ١٣٤٥ی هیجریدا ، موســـادیفی ١٩٢٦ی میلادی سـەفەری موســــــڵم کرد ، سیٚ مانگم پیٚچوو ، چوومە تەلەعفەریش . دیارە شیعرەکان ئەوسا نووسراون .

(٢) لە نووسینەوەیەکی تری ئەم پارچەیەدا کـــە نەمدۆزییەوەو لە یادمە ، ئەوە هەبوو کە ئەم پارچەیەی بۆ کۆچکردوو مەلای عەلیی ســـەحاف ناردبوو . دیارە هەموو پارچەکە شـێوەی خۆشـــــەویستیو گـاڵتـە لەگەڵدا کردنی تێدایە . چونکە مەلا عەلیی سـەحاف پیاوێکی زۆر سافو بێگەردو لە خواترسبوو ؛ دەبوو شـــاعیر باسی مزگەوتو زیارەتگای موسڵی بۆ بکا . بەڵام ئەم هاتووە باسێکیتری بۆ کردووە .

هەر غورفە ئۆتێلێ کە تەماشا کەی ئەبینی
مەحبووبەیە دانیشتووە مانەندەیی حوورە

گەر چاوی هەڵێنێ وەکو پێکاویە دلی من
ئانێ لە نیثاری قەدەمی دڵ بە کلوورە

ئەمڕۆ بە حەقیقەت لە بەهەشتا ئەگەڕێم من
شەت کەوسەرو مادامە پەری ، ڕەوزە قوسوورە

سەرسامە وەکو ( سەبری ) بە جارێ هەموو عالەم[٣]
لەم دەنگی ڕوبابو نەیو سەمتوورو تەموورە



(٣) پارچەکە کاتێك نووسراوە کە تەخەلوسی شاعیر ( سەبری ) بووە ، بەڵام کاتێك بووە بە ( سەفوەت ) ئەم نیو دێڕەی بەم جۆرە گۆڕیوە :
( سەفوەت ) کە وەکو گێژە ، بە جارێ هەموو عالەم

دوو مارە . دوو زنجیرە ، دوو سیحرە ، دوو تەلیسمە
غارەتگەری دینە ئەمە وا زولفی کــە ئیـــمە
زاهیـد کـە دی ئەو زولفە موبەڕڕا بوو لـە ئیمان
هـاوارە ئەمیــــتاکە ڕەشی کردووە بـە وسمە[١]
مەســـلەحەتی دی وەقتێ کە خۆی خستە دەمی یەم
شمشێری عەلی ، ئەبرۆی تۆی دی کـە بـە خەسمە
ئەم عیشوەیە ، ئەم لەنجەیە ، ئەم جیلوە لە ئینسـان
نەبووە ، مەلەکە ، هاتووە ، بەم سوورەتو جیسمە
بۆ ڕەغمی ڕەقیب دانیشـــە ، ئانی بـە نـەزاکـەت
پێم شـاڵبوو لە ڕێگایی غەم ئەم ســـاعەتە دەسمە
بێ مەیلی کەســـانم ، من ئەگەرچی تەکو تەنهـام
دولبەر تەکو تەنیـــا لـە بریتیی هەموو کـەسـمە
عاجز مەبـە ، جارجارە کـــە ڕووت لێوەرەگێڕێ
نازێکە لەلای دولبــەری تـۆ عـادەتو ڕەســـمە
( سەفودت ) غەزەلیاتت ئەگەرچی هەموو خۆشـن[٢]
ئەمما ئـەمـە شـیرداخـە کەوابێ[٣] بـە هەوەسمە[٤]

(١) ن : هاوارە ڕەشی کردووە ئێستاکە بە وسمە .
(٢) ن :

(سەبری) غەزەلیاتی ئەگەرچی هەموو چاکن

(٣) کەوابی – یا ئەگەر وا بی . یا ئەگەر ئەو توماشی شیرداخە ( کەوا ) بێ .
(٤) ن :

بۆ دەردی دلی خستە زمانی لەفیراقا
ماچێ لەدەمو لێوی بـە عینوانەوە بەسمە

بەچاوی تۆ سـولەیمان حیشـمەتا ، بەو ئیزەدی پاکە
سولەیمانی ئەگەر خاکە ، لەلای من عەرش‌و ئەفلاکە
هەتاکوو ئاسەفی تۆ بووم لەسـەر تەختی سولەیمانی
نگینم بوو ئەیانووت پێم لـە جامی جەم تەماشـاکە
هەتا تۆم یارو یاوەر بووی لەناو یاران ئەیانووت پێم
فریشتەی ئاسـانە ئـەم جوانە وا لەسـەر خاکـە
گولی شەوبۆیی زولفت بووم‌و پەروەردەی نمی گۆنەت
لە ڕووت دوور ئێستە ئەندامم سەراپا خارو خاشاکە
ئەگەر هەر ئەمکوژی تو خوا نیهانی با نەبێ شاهید
لە خوێنی من لـە ڕۆژی مەحشـەرا ئازا بە حاشاکە
لـە زولمی ئـەو ڕەقیبە بێ‌نەوایم گەیوەتـە ئاخـر
ئەگەر ڕەحمت هەیە سـا دادگاهی عەدلت بەرپاکـە
ئەمێستا بێ ڕووی دولبـەر نزیکتر یارم‌و یـاوەر
ئەلێ لێی دوورکـەون چاکە ئەمە دێوێکی بێ‌بـاکە
جەواهیر سـورمەیی چاوم غوبـاری خاکی بەرپێتـە
لە سایەی تۆزی بەرپێی تۆوە چاوم ساحێب ئیدراکە
لە بۆنی ئەو کراسـەی یۆسـفی کەنعانە چـاوانم
هەلێنا هەروەکو یەعقووب ئەبینێ ئێسـتە ڕووناکە
حەکیمان بینە لوقمان بێ عیلاجـە دەردی من لایـان
کە سینەی من بە شمشێری برۆی تۆ لەت‌لەت‌و چاکە
حەکیمان بینـە لوقمان بێ‌دەوایـە دەردی دل لایـان
عیلاجی دەردی (سەفوەت) وا لە خزمەت شاهی لەولاکە

## ٣١

باوەڕ نی‌یە ئەم زەخمە لە دلما کە بە شیرە
زەخمێکە لە دووری ڕوخی خانی ( نمە شیرە )[١]
مەعلوومە کە ئاشفتەیی حوسنی ( حەسەن )ێکم
شەو تا بە سەحەر بۆیە کە نالەم لە سەریرە
دل پڕ لە غەمی ڕوویی حەسەن زائیلی هەر غەم
بۆ مورغی قەفەس نەفعی نی‌یە ئەو کە ئەسیرە
ئەی بادی سەبا ، جارێ بە گوێما دە پەیامێ
تاکو بە نیاری بکەم ئەم جانی حەقیرە
من موفتەقیری نامەیەکم حەیفە بە قوزبان
دەئب‌و ڕەوشی ئەهلی وەفا خێری فەقیرە
شەرحی غەمەکەم چۆن ئەدرێ بەم دەس‌و بردە
بەدبەختی منە قاسیدەکەم ئێستە سەفیرە
( سەفوەت ) کە بە غیززەت غەمی دل بێتە نیهایەت
کانی ئەدەبە ، ئەمری بە بێ میل‌و نەزیرە

(١) « نمە شیر » گوندێکە لە نزیك بانە لە کوردستانی ئێران . دیارە ئەم شیرانە هەر لە سەرەتای ژیانی شاعیرو لە دەوری فەقێیەتیدا ، واتە لە ناوەڕاستی سالانی بیستدا نووسراوەو هەر پاش بەجێهێشتنی ( بێژوێ )یە کە لەوێ فەقێ بووە .

## سـۆزێك(١)

٣٢

فەلەك لەگەڵ منی ئاوارە هێندە بێمەیلە
بەنام هێناوەتە باخی بەهەشتو جێم وەیلە
حەتەم عەزابی لە دۆزەخ نییە بە عەکسی ئەوم
بەهەشتە جێم و ئەسوتێم لە دووریی ئەو لەیلە(٢)
چ پەنجەیێ بخەتی کێشا لە دۆسیەی زانیم
لە هەر میلاکی ژیانێ کەوا بەشم زەیلە(٣)
بوخاری بەحریێ سپیم وا لەسەر، نییە باکم
دوچاوی من کە ئەڕێژن بە خورژم ئەم سەیلە
لە باتیی نوێژی جەژن دێتە گوێم سەدایی جەڕەس
دلۆپ دلۆپ ئەتکێ خوێنێ لە دڵ ئەوەند کەیلە
بە یادی گێسووی دولبەر وە یا لە بەختی ڕەشم
هەموو تیلاوەتم ئێستاکە دەوری وەللەیلە(٤)
ئەژیم ئەمێستە لە لوبنان بە یادی کوردستان
کە چونکە ئەم کەژە وێنەی چیایی سیوەیلە

(١) دیارە کە ئەم پارچەیەش لە ساڵی ١٩٤٣دا لە لوبنان نووسراوە .
(٢) دەڵێن کە حاتەمی تەیو چەند کەسیتر لەبەر ئەوەی باوەڕیان نەبووە دەچنە دۆزەخەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی بە بێ باوەڕیی خۆشیان چاکەیان کردووە ، لە دۆزەخدا سزا نادرێن . لێرەدا شـاعیر وێنەیەکی پێچەوانەی دروستکردووە ، جێگەکەی بەهەشتە ( لوبنان ) ، بەڵام وەك دۆزەخ سزای تێدا دەردێ .
(٣) جاران یاسای ( ذیل ) هەبوو : فەرمانبەر کە دوو جار لە کار دەرکرایە ئیتر هەرگیز چوونەوە سەر کاری نەبوو لێرەدا هەموو ژیان بە فەرمانبەری تەشبیە کراوە .
(٤) خوێندنەوەی سوورەتی ( واللیل ) ، نیشانە بۆ خەمناکی و تاریکی .

— ٣٣ —

## لە سەر
## گۆڕی مەولانا خالید[١] ...

لە نیشتمانی تۆوە ئەوەی تۆیە هاتووە
( سەفوەت ) دڵ زارو دەردەدارو برینـــدارو مانـــدووە
لەو ڕێگە دوورەوە لە ســـلێمانی تاکو شام
ڕێگەی بڕیوە وا بەری دەرگـــایی گـــرتووە
لەم بارەگایە مل کەچو بێ‌تـابو بێ‌نەوا
کـــورد زادەیێـکە عارەبی دامانی گـرتووە
خالیـد نیگاهێ بۆ منی بێکەس میوانی تۆم
لەو خوانە وا لە بەردەمی میوانت ڕشـــتووە
هەرکەس ، لە کەس لە ناکەس چەشتی پارویەك
بێ شـــوبهە تامی نیعمەتی جەنـــاتی چەشـــتووە
یەك لوقمەیێ بنێرە دەمم گـــەرچی ناکەســم
وا بزانە سوالکەرێکە لە دەرگـانە کەوتووە
مەولایی نەقشـــبەندییو چەشـــتیی‌و قادری[٢]
دڵ بێ‌نیگاهی ئێوە لـە نـاو ســـینە مردووە

١٣٦١
١٩٤٣

(١) سالی ١٩٤٣ کە بەرەو لوبنان چووە نووسیویەتی ، سۆزی ئەسەرندر دووربی نیشتمان تێکەڵبووە .

(٢) ناوی سێ تەریقەتە .

هەر شـــەوێ عەیشێ ئەبینم حەســرەتێکی وا لـــە دوو
عەیشێ وا بێ حالەتی ، یا ڕەب نەکـەی لێی یەك بـە دوو
هـەر هومایوونێ کـــە دوێنێ شـــــاهبازێکی هـەبوو
خالی‌یە ئێســـــــتا لـە جێگەی ئەو دەخوێنێ کوندەبوو
ئـەو تەعـامـەی هـەوڵ ئەدەی بۆی‌و بـە پارە ئەیکڕی
چاترینی ئـەو تـەعـامێکە کــە زووتـر بێ بـە گـــوو
هـەر ســـەحەرگاهێ لـە مەئمووری خواوە بۆ بەشـەر
دێ ســــــــــەدایی ( للخراب ابنوا ، وللموت لدُوا )
چەندە پێم خۆشــــــە بە کوردی دەنگی خالەی ڕێبوار
ڕێبوارە ئەهلی دنیــا هەرچی هـــاتو هـەرچی چـوو
عارفێ پرســـی لە دنیا چۆن بـە بیکری ماوی تـۆ ؟
خۆ بـە ملیۆنـا هەتاکو ئێســـتەکە کردووتـە شـــوو !
جوابی دا دنیـــا کـــە خۆم تەسلیم نەکرد بۆ نـا پیـــاو
پیـاوێکیشـم قـەت نەدی مائیـل بـە من بێ ڕوو بە ڕوو
ڕۆیـوە ڕۆیـو نـەهـاتــە ، بـۆ نـەهــات عـاجـز بێ
حالـە تـۆ گـەر ئەهلی حالی بـا نەچی مانەنـدی چـوو
ئولفـەتی نەفـــت بچێ بێ‌لەززەتو خۆشـــــی ئـەوە
ســـــا بـە چاکـەو زوهدەوە گەر عاقلی تـۆ بگرە خوو
( ســەفوەتا ) گـەر ڕاست ئەکەی دنیات وەها ناسیوە تۆ
پێرە دەر تـا تۆزێ مـاوی ڕووکـــە مەولا زوو بـە زوو

٣٥

بگری ده بگری بۆ عومری فەوتاو
بگری بۆ دلی ئالاّتەداو
کەوا تەفرەت دا بیست سالی تەواو
بە بێ حەقیقەت بە خەیالی خاو
ئەتوت ئەو مەلە کە دلدارمە
یارو یاوەری وەفادارمە
کوانێ مەیلەکەی ، کوا وەفاداری
کەی وایە شێوەی یاریو دلداری
تۆ وا بسووتێی بە بێ قەراری
لاپرە سەنگی بێ بە باری
بە بیانوو ئێستا لە تۆ تۆراوە
یادی تۆی ئەبەد لە لا نەماوە
شێتە تۆ لەسەر عەشقی جارانی
بە خەیالی خۆت لەگەل یارانی
شەو بە ئاخو داخ هەتا بەیانی
ڕۆژ گەردن کەچی ژێر پاسارانی
وەك هەتیو ملت ناوە بەلاوە
چونکە ئەو مەلە لە تۆ تۆراوە
ئەو مەلەی دلم بۆ کرد بە قەفەس
پەروەردەم ئەکرد بە هەواو هەوەس
دلم بۆ ئەگرت لەسەر بەری دەس
خۆم بە دەستی خۆم دامە دەست ناکەس
ئێستا سەیری کە لە من تۆراوە
وەك پەشیماندار شاخم لێ ڕواوە

کەی تۆ دڵەکەی جارانی منی
کەی چرای بەزمی شەوانی منی
کەی مەرهەمەکەی زامانی منی
کەی هاورازەکەی پەنهانی منی
ئێستا وای لەلای شەیتانی پیسی
گوڵو گرژو مۆن لاتی مل سیسی
خۆ تۆ گوڵێ بوویت ئەمنایتە سەردەست
بە بۆنی خۆشت هەمیشە بووم مەست
خاوەن شوعوورو بیرو هۆش و هەست
بە یادت هەبوو هەمیشە هەڵبەست
پەری ، لەگەڵ کێ بوویت دەست لە مل
کێ دیویە پەری و جنۆکە هاو مل
گریەو گرەی دل گەر بێ و بکا سەر
تۆزێ بلێسەی ئەگەر بێتە دەر
عالەم ئەسووتێ ئەبێ بە مەحشەر
پەردە لا ئەچێ لەسەر خێرو شەڕ
وەك دەردی دڵم کەس پێی نەزانی
با خۆم بسووتێم هەر بە نیهانی
ئاخ دەستم کەوێ گەر وەفادارێ
بۆی بکەم وەسیەت بدا بڕیارێ
مردم بنێژێ لە ڕێ گوزارێ
ئەو مەلە بڕوا بە لاما جارێ
بزانێ کوشتەی دوو دەستی ئەوم
لە ژێر ئەو خاکەش سەرمەستی ئەوم

## پێنج خشتەکی
## لەسەر
## شیعری زەبیحی

لەسەر تەرزی بەهەشت ئێزەد خەتی ڕوخساری کێشاوە
حەدایق گێسووەو کەوسەر لەسەر دوو لێوی داناوە
وەکوو غیلمان لە هەر لا دانە دانە خالی لێداوە
عەزیزم ،دولبەرم ئەمڕۆ نیقابی زێڕی لاداوە
لە خەتتو خالی ڕەنگینی هەموو عالەم خورۆشاوە

★ ★ ★

گەلێکم دی ووتی عاشق مەچۆ مەیدانی مەعشووقان
چی یە وا بوویتە سەرداری دلێری ئولکەیی تووران
بە زۆری هێزی بازووی خۆت مەنازە ڕوو بە ڕووی جانان
کەمەندی زولفی چین چینی ئەکێشێ جانی عوشاقان
. . . . . . . . . . .(١)

★ ★ ★

بڕۆ بەو لاوە ئەی واعیز بە بێ هوودە مەدە پەندم
لە تۆ داناترم بە خوا ، بەلا من عاشقو ڕەندم
نەجاتم چۆن ئەبێ من نوقمی نێو دەریایەکی مەندم
لە چاهی غەبغەبی جانا دو زولفی بۆتە پابەندم
ئەلێی شاهی سیاوەخشە لە توورانێ ئەسیر ماوە

★ ★ ★

(١) ئەم دێڕە لە دەستنووسەکەدا نەبوو

نیگارا کوشـــتنی شـــیرینت ئەلبەت بیـــتووە بۆچی
لەســـەر ســـەر تاقی ئەلبورزا وەســـیەت نامەیێکی دی
لەسەر ئەو تاقــە نووسرا بوو بە نووکی قولنگی فەرهادی
وەکوو لەیلا مەکە جانـا کـە مەجنوون مرد لە عیشقی وی
ئەلێی خوێنی سیاوەحشە کـە ئێستاش جۆشی هەر مـاوە

★ ★ ★

لـە خوێنـا گـەوز ئەدەم ئەتلێمەوە گولگون بووە بەرگم
وەکوو بێژەن بەدەن‌کون‌کون بە صەد موژگانی وەك زەرگم
دەســـا ڕووت بێنە بەم لاوە بەرەو ڕووم هاتووە مەرگم
خەدەنگی قەوسی ئەبرۆی تۆ وەهای لەت کردووە جەرگم
ئەلێی ئەســـفەندیارە ، ڕۆســـتەمە چەند تیری لێ‌داوە

★ ★ ★

هەراســـــان ڕەفیقـانم لـەبەر هـاواری بێ کـەلـکم
بـە قرچەو بۆچڕووکی ســینەکەم باوەڕ نەکەی بەشـکم
لـە مووســـایی بەنی عیمران بپرســــە پێت بلێ بەلکم
تەجەللایی جـەمـالی تـۆ ئـەکـا بوریـان دڵو جـەرگـم
بە میـــلی کێوی توورە دڵ ، بە نووری عەشق سووتاوە

★ ★ ★

وەکوو پەروانــە هەتیــە دڵ ئەگەر سووتاوی عەشقت بوو
وەکوو فەرهادو مەجنوون،هەر کەسێ فەوتاوی عەشقت بوو
هەزارانی وەکوو ( سەفوەت ) کەوا ڕیسوایی عەشقت بوو
نە تەنیا هەر ( زەبیحی ) غەمزەدەی سەودایی عەشقت بوو
ئەبینم کوشــتەگانی تۆ لــە مەشــریق تاکـو ڕۆژئـاوا

★

## بۆ شینی بێخود (١) ..

من ئەدیبی بە ئەدەب شـــاعیری دەورانم ڕۆ
من سەناخوانی شەهەنشاهی رەســوولانم ڕۆ
عابیدو زاهیدو عاشــق بە جەمــالی حەزرەت
هەموو شەو تاکو بەیان دیدەیی گریانم ڕۆ
گفتوگۆ خۆش‌و بە هۆشی بە تەبەسسوم دایم
خاوەنی شـێوەیی شیرین لەبی خەندانم ڕۆ
دێم دەچم هەروەکو پەروانە لە دەوری ڕووی شەم
بێ زوبان دڵ ئەڵێ ئەی شـــەمعی شەبوستانم ڕو
هەر وەکو بولبولی دوور کەوتە لـە گولزار بە زار
نالەمە ئەی گولی خۆش‌بۆیی گولـــستانم ڕۆ
مانگی چواردەم لە ســــەمایی ئەدەبا ئاوا بوو
لەم بیابانە بەترســـە مەهی تابانم ڕۆ
شـینی ڕەنگینی ئەدیبان کە سەدای گەیە سەما
خەست‌تری کەم من ئەگەر سەدری ئەدیبانم ڕۆ
کێ لە مەیدانی ئەدەب تاوی ئەســـپ دا بێخود
شـۆڕە سوارێکی سیلاح شۆڕی لە مەیدانم ڕۆ
گولی گولزاری ئەدەب بوو پچڕی چنگی ئەجەڵ
شـــاگولی ئەنجومەن‌و مەجلیسی عیرفانم ڕۆ
نیکتەبازی لـە ئەدەب لایقی تۆ بوو بـە خووا
ســاحیبی تەبعی ڕەوان بولبولی خۆشــخوانم ڕۆ
بە جیناس‌و بە لەتافەت هەتە سەبقەت لە کەلیم
لە سەناو مەدحی ڕەســوولا بەڵێ حەسسانم ڕۆ
گولی ڕێحانەت ئەوێ ســەیری بکە دیوانی
خاوەنی باخی بە نرخی گـولو ڕێحانم ڕۆ

(١) لە ڕۆژی ١٩٥٥/١٠/٢دا لە چلەی بێخوددا خوێندراوەتەوە .

شاعیران گەر وزەرای کیشوەری شـــیعرو ئەدەبن
تۆ شەهی کیشوەری شیعری شەهو سـولتانم ڕۆ
گـەر بـە فیردەوسی ئەکـەن فارســەکان شانازی
ئیمڕۆ من ســــــەعدی‌یو فیردەوسی‌یی کوردانم ڕۆ
مەولـەوی‌و کوردی‌یو ســـالم وەکو حاجی‌و نـالی
مەحوی‌یو موخلیس‌و خاکی وەکـو عیـرفـانـم ڕۆ
چـۆن ئـەجـەل بردی بە مفتی[2] بنەمـالەی ئیفتـا
موفتی‌یـانی وەتـــەنو ئـۆلـکەیی بـابـانــم ڕۆ
ســـالی تەئریخی ئەنووسـی ( لە بەهەشتا بێخود )
( ساکنی باخی جینان )[3] ، هەمـدەمی ڕیزوانم ڕۆ

(٢) ئیشـــــارەتە بۆ کۆچی دوایی مەلا عەزیزی موفتی ، کە دووا موفتی‌ی سولەیمانی بوو و دوا موفتی‌ی بنەمالەی موفتی‌ی چاومار بوو .
(٣) ( ساکنی باغی جنان ) .

## ـ ٣٨ ـ

زەمـــانی بـاغی میـرو تـانجـــەرۆ بێ
ئەبێ ئەهلی هونـەر هـەر ڕەنجەڕۆ بێ
بـە پـانـــدانی درێـــژی ئیـــگنەباشـی
ئەبێ چی باکی بێشـــــەرمی و درۆ بێ
لـە پردی تانجـەرۆ ڕایخـەن وەکو پرد
ئەبێ ئیتر بـــە چی ســـــووك‌و ترۆ بێ
کەســێ مەیلی لـە مەردی‌و پیـاوەتی بێ
بەمانـە چۆن ئەبێ ئـەو دەســـخەرۆ بێ

دڵ ئاشـــفتەی بتێکم عیشـــوەگەر زونـار بەردۆشێ
لە ڕووی خۆی پەردە گەر لادا عوموومی عالەم ئەخرۆشێ
سەرم سەرگەردی ساقی بێ کە ئیشـــەو بادە ئەفرۆشێ
چ بـادە ، بادەیەك لادا ، لە ســەر عەقڵێ ، لە دڵ هۆشێ
دەسـا قوربانی ئەو ڕەندەم لە دەســـتی ئەگرێ ئەینۆشێ
ئەتۆش موتریب بە کۆیلەت بم ، تەرەب سازانە سا جۆشێ

★ ★ ★

لـە ئامۆژگـاری‌ی شاهێ وەهای ووت دوێنێ دەروێشێ
کوت‌وپڕ نووچ ئەدا ئەگلێ ســوواری ئەسپی سـەرکێشێ
جیهـان هەنگێکە هەنگوینی نی‌یە ، خالی لـە هەر ێشێ
کەسێ مەردە لـە دنیـادا نەترســـابێ کـە لێی مێشێ
شوکر نەیدی لە دەستی من هەتا ئێســـتا کە کەس ئێشێ
لـە ئێش‌و ێشـــی خـەلقم چی نیـــگارم بێتـە ئاغۆشێ

★ ★ ★

لـە ئیجـادم چی‌یە حیکمەت ؟ کـە من بێ خێرو بێ بێرم
گـەهێ عـالـم لـــە مزگـەوتـام‌و گـاهێ ڕاهیبی دێـرم
لـە کونجی تەکیـە گاهێ دەنکە دەنکە ســـبحە ئەژمێرم
گەهێ مەستم لـە مەیخانـە بە بێ‌هۆشی کـەڕ و کوێـرم
گـەهێ حـــەربی ڕەقیبـە تیـری ئـاهـم زۆرە ئـەینێرم
بلێن بـا بێتـە مەیـدان بـۆم زرێی چی لایـە بپۆشـــێ

★ ★ ★

بـە ڕێی عەشقا ئەڕۆم من گەر ســەرم لەم ڕێگە دانـاوە
ئەگـەر ئەم لایـە یا ئەو لایە ، هـەر دووم ناوەتـە لاوە
بـە شـــەرتێ ئەو نیگارە ڕوومەتم بـۆ بێنێ بـەم لاوە
خەلاتی ماچی گۆناکـەی ، بەهەشتە بۆی کـە دامنـــاوە
لـە ئەووەل ڕۆژەوە ئیرســـە لـە ئـادەم بۆم بـەجێ‌مـاوە
بـە ماچێ چۆنی ئەفرۆشم ، بـە گەنمێ ئەو کـە بیفرۆشێ

لە ئەووەڵ خەتوەیی عەشـــقا کە سەر دانانە سـەرانـە
بـە بێ‌دەنگی لـە ڕووی مۆمدا بسووتێ چەشنی پەروانە
وەکوو بولبول لەسـەر چڵ گیانت بسـپێری بە ئەفسانە
هەمووی ئاسـانە شەرتی عەشـق ڕازی دڵ نەدۆڕانە
نەوەك مەجنوون کە لەیلای خستە زاری خۆو و بێگانە
ئەوا ( سەفوەت ) کە ڕازی بردە گۆڕ یار بێت‌و داپۆشێ

★

دڵ

٤٠

دڵـم کـەوتـۆتــە دەســـتی بێ میـزاجێ
وەکوو یەك سەیر ئەکا کەشـــکۆڵ‌و تاجێ[1]
لــە بـازاڕی ڕەشـــی ئـەهـلی زەمـانـا
عەشـــق بۆچی ئـەبـەد نـەیـدی ڕەواجێ
لــە مزگـەوت واز ئەهێنم بـۆ کڵێـــسا
کـــە دڵ کـەوتۆتـە داوی زولـف خـاجێ
لـە شیعرت دەستت پڕ گەوهەر کە یووسـف
لـە بـازاڕی مـەزات ئـەکـرێ هـەڕاجێ
کـــە ڕوتبـەی علم‌و ئیرشـادم عەبەس چوو
ســەری ڕێم گرتووە بـۆ ســوودی باجێ
لـە سـایەی عەشــقە موســتەغنیم و نیمە
بـە ســـامانی جیهـــانێ ئیحتیـاجێ
تـەبیبی دەردی دڵ تـۆی خــۆت ئـەزانی
بـە ســـاقەی چاوەکانت بـم عیلاجێ

(١) کەشکۆڵی دەروێش‌و تاجی پادشا .

## بـۆ شێخی نەمـر

### ٤١

شـــەهم شێخێکە مەحموودە لەســەر مولکی سولەیمانی
هــەزاران غەزنەوی هــاتونــە ســـــایەی بوونە دەربانی
شـــــەهم شـێخێکە صیدیقی نی‌یە کێویکی تـەمکینە
ئەوەندەی فەرقــە بەو ئەووەڵ ئەڵێن ئەم حەیدەری سانی
شـــــەهم شێخێکە فاروقی لـە عـەدلی ئـەو گورێزانـە
هەزاران میـــلی جەبلەی[1] ئەیهەمی سولتانی غەســانی
شـــەهم شێخێکە عوسمانی حەیاوو شەرمە شێوەی ئـەو
لەگـەڵ عوسمان نی‌یە فەرقی بـە غەیری جەمعی قورئـانی
لەگەڵ ئەو حیشمەت‌و جاهە ئەوەند بێ عوجب و بێ کیبرە
ئەبێ وابێ نەوەی ئەحمەد ، ڕەســـــوولی شـــاهی عەدنانی
بەشـــــەر قەت بێ نەقس نابێ درێژە دەستی بۆ هەر شت
ئەوەندەی نەقســە ئەو دەســـتە کە قەت ناگاتــە گیرفـانی[2]

(١) جەبلە : جەبەلەی کوڕی ئەیهەم ، لەبەر کێشی شـــیعر ناوەکەی لێرەدا کراوە بە جەبلە .

(٢) ئەم شیعرانە لە سـەرەتای سـالانی پەنجادا نووسراوە. شـاعیر دەیگێڕایەوە کە شێخی نەمر ڕۆژێك لە داریکەلی‌یەوە هاتبووە ئەللایی لای تاسلووجە، هەوالی بۆ تاقمێك لە مەلاکانی سلێمانی ناردبوو که بچنە ئەوێ ، چونکە حەزی کرد بوو بیانبینێت . شاعیر دەیووت : بەدەم ڕێگەوە ئەم چەند دێڕەم بۆ هات ، کە دەستم کرد بە خوێندنەوەی ، شێخ دەستی خۆی دەگوشی‌و هەر دەیووت : مستەفا ... بە خوا من ئەوە نیم . تا گەیشتمە دوا دێـڕ ، پێکەنی‌و ووتی : دەك خـوا بتـگرێ ، هــەقی هــەمووت لێ‌کردمەوە . دیارە شێخ لەوەش گەیشتبوو کە ئەم دێڕە بۆ ووتراوە . ئەوە بوو لە سالی ١٩٥١دا شێخی گەورە ، دووەم جاری بوو کـە پـاش حوکمداریی خۆی بێتە سولەیمانی ، پاش پێشـــوازی‌و زیارەتکردنی ، ئەویش زیارەتی گەلێ شوێنی کرد . یەکێك لـەو شـوێنانـە مزگەوتی حاجی مەلا ڕەســـــوول بور ، کـــە خەلیفەی کاك ئەحمەد بووە . ( سـەلوەت )یش مەلای مزگەوتەکەی باوکی بوو . مزگەوت تێکدرا بوو ، شێخ لە گوێ حەوزەکە دانیشت‌و حەوزو باخەکە مابوو ،چا خورابەوەو چەپکێ گولی باخەکەی پێشـــــکەش کرا . زۆر دەربارەی مزگەوت‌و چاکردنی ووترا . خەڵکی گەڕەکیش بە تەما بوون ، کە شـێخی گەورە بەشداری دروستکردنەوە بێ بەلام نەبور . دیارە ئەم دێڕەش باســی ئەوەیە .

## ٤٢

جیهـان وەك ســـینەما وایە هەموو ڕۆژێ لە سەد ڕەنگە
لـە خۆت بایی مەبـە بەم ڕەنگە ؛ گۆڕ گۆڕخانەیی تەنگە
ئەوەی وا دێتـە دنیـا شـــینی بۆ بکەن چاتـرە لای من
چی‌یە ئەم چەپلە ڕێزانـە ، چی‌یە ئـەم شـایی‌و ئاهـەنگـە

○

## ٤٣

ئەی نەفسی بەدی پیـــــی دەنی غـەرقی مـەناهی
ســـەر تـا بـە کەمەر ؛ تا بە قەدەم غەرقی گونـاهی
ئامێزشی عیـــــــــیانو مولازیم بـە مەنـاهی
بـەم حالـە بـە ئومێدی عەفـو ، ڕەحمی ئیـلاهی
ئەی هەمدەمی دونیا ، هەموو دەم دەمدەمی بـاری
بۆ سیحری تیجـارەت وەرە تـۆ ڕووکـەرە بـاری
ڕۆژێ کـــە نیـە غـەیری فیغـان گریـەوو زاری
ئـەو ڕۆژە بـە بێ مەلجـەئـو بێ پشـــتو پەناهی
ئەی پڕ لـە هەواوو هەوەس‌و عوجب‌و جەهـالـەت
خاڵی لـە خوزووع‌و لـە خوشووع‌و لـە فەتانـەت[1]

(١) فەتانەت : ( فطانة ) .

مەحوە هەموو زەڕڕاتی وجوودت لـــە شـــەقاوەت

بێزادو لـــە پێ کـــەوتـــەوو دوورکـــەوتەیی ڕاهی

ســـەرباری هەمووی بوومـــە ئەسیری دەسی کافر

شـــەیتانە ، لەعینێکە لە مەکرا ، وەکو ســــاحیر

بۆ تەفرەی ئیســـلامی زەعیف زۆر ســـەگی ماهیر

ئیســـلامەتییم چوو لـــە دەست حەشمەتو جاهی

وەبزانـە کـــە خاوەندی هـــەموو مولکی زەمینی

ســــاحێبی نیگاری خوتـــەنو شـــەنگولی چینی[2]

وەك شــــاهی سولەیمانی ، بـە تەختو بە نگینی

یـا شـــاهی کەیانیتو بـە تـاج و بـە کـولاهی

هیچ نابەیە نـاو قەبرەوە ، بە خوا لە دوو ســـەد لەك[3]

( سەفوەت ) ئەتـەوێ دەفتەری عیـیانت بە بێ حەك

نەســبی کـە لەبەر چاوت ( ولا تنس نصــــیبك )[4]

بێ فـەرقـە کـە مردی ، چ فەقیری‌یو چ شــــاهی

(٢) شەنگول : جوان ، شۆخ .
(٣) لـەك : سـەد هەزار .
(٤) بە عەرەبی واتە : بەشی خۆت لە بیر نەچێ .

٤٤

ئاوی چاوی خوسرەوو خاکی کەلاکی قەیسەری
بووە نیتێك ئاوو نزایە چینی فەسرو قەیسەری
ڕوو بە ڕوویی دانرا ئینسان ئەگەر هۆشت هەیە
بێتە سەر ڕێگەی حەقیقەت عیبرەتی لێوەرگری
گەیە شاهەنشاهی ئەسکەندەر لە ڕوتبەی دونیەوی
ڕوتبەیی دینیی گەیشتە پایەیی پێغەمبەری
گوێ گرە بانگی دەهۆڵ وا پڕ بە دنیا بانگ ئەکات
تۆبەتی کێیە تەواو بوو تۆبەتی ئەسکەندەری
ئاشە ئەم چەرخە دوو بەرداشی زەمینەو ئاسمان
ئادەمی باراشە ئەیهاڕێ بە دیققەت تێفکرێ
دانەیێکی کەوتوویتە بەینی دوو بەرداشەوە
شێتی لات وابێ کە نەتهاڕێ و سەلامەت تێپەڕی
ڕۆح لەبەر: نیشان ، ئەجەل : تیرە ، کەوانە : ئاسمان
خاك بەسەر ئێمە کە تیر ئەندازە زاتی داوەری
( سەفوەتا ) بیخۆیتەوە سەد جار ئەگەر ئاوی حەیات
ئاخری ئەمری دەسا ئازابە ئیمان دەربەری

٤٥

شاعیران پیرێ لە دیوان بۆچی بوونە ئەنوەری
من بەجێمابووم هەمە خۆ زەوقی شیعرو شاعیری
کێ ووتی ( سەفوەت ) مەهێنن با نەیەتە کایەوە
تا وەکوو خامجاوی زوو بیکەم تەواوی گازری

— ٤٦ —

بێخود ! شـــەو ئەگەر هەتا بلێی تاریـکە
ڕێـگەیش بــە خــودا درێــژ و بـاریـکە
کاروان هەموو بـاری کرد ڕۆیشـــتن تۆیش
خـۆت گورجـەوەکــە کە ڕۆینت نزدیـکە(١)

(١) ئەم چوارینە لە دیوانی بێخوددا بە ناوی بێخودەوە تومار کراوە ، بە نووسینەوەی چەند جارەی بە خەتی سەنوەت لە ناو شـــیعرەکانی خۆیدا ، دیارە شیعری ئەمەو لە شێوەی گاڵتەدا بۆ بێخودی نووسیوە . کە لە شوێنی تری دیوانەکەدا ئەم چەشنە گاڵتەیە هەیە .

— ٤٧ —

بـرا گەورەکـەم(١) ، گیانی شــیرینم
عیــزەدین ئـەتـۆیش عیــززەتی دینم
ئـەمـڕۆ بـــە جارێ دڵ تـوایــەوە
چی خۆشــــیم دیبوو هـەمووم دایەوە
لــە خزمـەت مەرقەد یەحیــایی نـەبی
مــەولانــا خـالیـد ، ئیبنولعـــەرەبی
ئـەبـا عوبـەیـدە جــەڕڕاحی ئـەمین
هـەم ســـنجاقداری ڕەســوولی گوزین
ئەبوو ئەییووبی مەشـهوور بـە کەڕڕاد
ســەلاحەددینی شــــانازیی ئەکـراد
لـە خۆشییانا وەســــــتام بـۆ نیــاز
بووم بـە گیـسکەکەی بەر دەرکی ئەیاز

(١) ئەم شیعرانەش ساڵی ١٩٤٣ نووسراون ، وەك نامەیەك کە بـۆ مـەلا مەحموودی برای بنێررێ ، لە شامەوە ، کـــە بەرەو لوبنان چووە ، دیارە تەواو نەکراوە .

٤٨

یاران ، دلسۆزان ، یاران ، دلسۆزان
با بێ لە ئێوە یەکێکی حاڵزان
تووشی دەردێ بووم نی یە دەرمانی
زامێکی پڕ سۆ لە دڵ نیهانی
هەڵس و کەوتمە وەك ئێنسانی شەل
تەپوتل ئەدەم کەوتوومە دووی مەل
ئەو مەلەی کە کەس ناوی نازانێ
نەمخستە سەر زار بۆ هەر نەزانێ
پێم ئەڵێن بۆچ وا حالت پەشێوە
نازانن وونە لەو مەلەم شێوە

٤٩

ئەو سەرکەشە ، پەرچەم ڕەشە ، ئەو چاوگەشە تاکەی
بۆ من بە ڕەوا شەربەتی مەرگ و بە ڕەقیب مەی
بەم دەربەدەری و دووری یە ڕاهاتووم ئەمما
داخم ئەوەیە غەیرە ئەدا دەورەیی کەعبەی
ئەو موسحەفی ڕوخساری یە لەو پیە حەرامە
ئەم دەستە بە دەست نوێژە لە بۆ زولفی بە حەلقەی
دولبەر بە نەزاکەت ووتی کوا شاهیدی عەشقت
لەو ڕۆژەوە لاوازم و گۆڵەم بە مەسەل بەی

حوکمی دلی دا مەحکەمـــەیی عـەشـــــــقو نیـگارم
گرتی بـــە لیمـــان خـــتیە نـاو گۆیی هەیاســـەی
مەجنوون کـە ئەڵێن گەورەیی عوشاقی جیهـــان بوو
ڕازی دلی دۆڕانو نـومـــایـــان بـوو لـــە چیهـــرەی
بـڕواننـە ئـەحـوالی ئەنیـــی شـــــەوی عوشرەت
ســـینەی هەموو کون کون بووە وا ئەمڕۆ وەکوو نـەی
دوکتۆر و ئـەتیببـایی عیـــــراقو هەمـــوو لوبنـــان
کـول بوونو بـە دەردی دلـەکـــەی من نـەبـرا پـەی
ژینم بـــە گەدایی‌و بـە شـــــــەهی کورت و درێـژی
ئەیکەم بە فیـدای نیـوە نیگاهێـکی بـە عیشـــوەی
دەرچـــوو لـە کـــەوانی برۆ موژگـــــانی بـە ڕیـزە
گوێ بگرە لـــە هـەر ســینەوە دێ نالەیی یـا حەی !
لـەو تیری موژە بۆچی بترســــێ ئـەبێ عاشـــــق
ســەد مردوو ئەکـا زیندوو بـە یـەك دەم بـە هەناسـەی
دڵ بەســـــتەیی هەودایـەکی گێســــوویەتی یـا ڕەب
بـۆ ئـــاوی حـەیـــاتێ بـڕژێنێتـــە چـەنـاگـــەی
وەقتێ هـەتـە ڕوتبـە لـــە عەشــــقدا بـە هەناســـە
بتوانی کـــە ئـەو زولفـە لەســـــەر ڕوومەتی لادەی
( ســەفوەت ) ئـەمـە سیرڕێکە لـە مزگەوتەوە بۆ دێـر[1]
خـۆ تـۆ بـە حیســـــابێ لـە هەواخواهی مەدینـەی

(۱) دیارە کە ئەم شیعرانەش لە لوبنان نووسراون . مەبەس بە ( دێر )یش هەر سەنەلاوربلام ( مەسەح )ی بەحەنەسە کە سەر بە ( دێر )ێك بوو ٠

٥٠

جانا بلێ بۆ عاجزو بۆ پەستو کەساسی
بۆ موزتەریبو ماتیی‌و بۆ غەرقی پەلاسی
شۆخێ کە سەماواتو زەمینی بە دووا چوویت
ئێستە لە دلا دیمەوە ، دلداری سیاسی
تۆ هاتییە دنیاوە بە ڕووتیی‌یو بە قووتی
ئێستە چیە ، بۆ مائیلی پۆشینی لیباسی
گەر عەبدی خودای ڕوو لە خودا کە بە سەداقەت
ئیتر چیە بۆ موختەلیتی زومرەیی ناسی
دەریایەکە بێ پەی لە بەرابەر کە ئەبینی
ئەمڕۆ من ئەچم بۆیی‌و سبەی تۆ بە سەراسی
هەرکەس کە چووە ناو سکی ئەو بەحرەوە خنکا
وەك قەترە بە دەریا نیە نیشانەو باسی
کوا تەختی سلەیمانو هەموو حیشمەتو جاهی
کوا قەسری ئیرەم ، باغیی‌یو ئەنهارو ئەساسی
( سەفوەت ) دلی تۆ خەلوەتی دلدارە بە بیللا
ڕووناکی کە ، پاکی کەرەوە تۆ دلی قاسی

پێم ئەڵێن گۆشەگری و ئەومە لە نێو شاری[1]
دۆست پەرستم بە هەزارو کەچی نیمە یاری
پێم ئەڵێن نیتە سیاسەت ، ئەوەتانی بە هەزار
لە بنا دەست ئەبڕم تێنەگەیشتن جاری
پێم ئەڵێن علمی نیە ناوی لە خۆی ناوە مەلا
مێزەرێکم لە سەرە من بە قەدەر دەستاری
پێم ئەڵێن عەقلی نیە بێبەشی فەهمو دانش
ئەی ئەبێ بۆ نەبە گەورەیێ یا سەرداری
پێم ئەڵێن کاسبی ناکات و لەبەر چاویشیان
نیشتمانێ ئەفرۆشم بە دوو سێ دیناری
پێم ئەڵێن کەی ئەمە شیعرە ، بەچی بۆتە شاعیر
حیکمەت و پەندی برایانە بە چەند ئەشعاری[2]
پێم ئەڵێن مولکی نیە ، زۆرە بەڵا بێسەمەرە
ئەم هەموو مولکە کەوا مایەوە بێ سەرکاری
پێم ئەڵێن دوو ڕووە وەك نیسك و منیش هەڵناتم
هەردەمە ئەومە لەسەر لایەك و نیمە باری
چی بڵێ ( سەفوەت )ی بێچارە لەگەڵ ( لا یسال )[3]
چەند سەگێکی هەڵەپاس بوونە ئەدیبی شاری !

(١) ن ـ ئەومە لە نێو ملیاری .
(٢) ن ـ ئەی چیبە ئەم هەزەیاناتە بە چەند ئەشعاری .
(٣) ( لا یسال ) ـ مەبەس خوایە .
(٤) ن ـ هەرزەگۆیێ ئەیەوێ بێتە ئەدیبێ شاری .

## تەخمیسی
## چەند دێڕی مەولانا خالید

٥٢

کوا سولەیمانو سکەندەر ، کوانێ خەتی مورسەلین
کوا شەهەنشاهانی عالەم ؛ کوا مولووکی ڕووی زەمین
نەفسی بەد تاکەی غورووریو سەرکەشیی خولیایی ژین
( چشم عبرت برگشاو تاج کسرارا ببین )
( پردەدارش عنکبوت و جغد نوتی زن بود )

★ ★ ★

کێ لە ژێر ئەم چەرخە شینە گەی بە ئامانج و مراد
کوا سولەیمان و نگینی ، تەخت و حوکم و عەدڵ و داد
کوا کەیان کەیکاوس و کەیخوسرەوو شا کەیقوباد
( گردش گردون هزاران خاندان برباد داد )
( نە همین بد مهریش با تو است یا با من بود )

★ ★ ★

دەستە دەستە هاتو ڕۆیی دولبەرانی کەچ کولاە
نازەنینان بوون بە خاك ئەی دڵ دە بگرە ئینتیباە
گوێ گرە چی فەرمووە ئەو عالەی عیرفان پەناە
( پا بخاك آهستە نی « خالد » کە این خاك سیاە )
( از غبار خط مهرویان سیمین تن بود )

٥٣

ویستم لە لێوی ماچێ ، ئەو لەیلە نابێ ڕازی
ئەڵێ هەتیو بترسە لە عەدڵو دادی قازی
بیانووت هیوایە یاخۆ هەتە نیازی نازێ
وەرنا چ سەهلە قازی ڕازی ئەبێ بە قازێ

پەیکی دلسۆزی عالەم شەماله ‌ ‌ ‌ پەیکی من بای وەشت

سەرەو ژوور بڕوا بگاتە مۆسکۆ ‌ ‌ ‌ بە سەیرانو گەشت

نامەم بۆ بەرێت بۆ کێ ؟ بۆ گولم ‌ ‌ ‌ بۆ میوەی دلم

بلێ بولبولی باغچەی ژیانم ‌ ‌ ‌ غونچەی سەرچلم

عیزەتی دینم ، عیزەتی دنیام ‌ ‌ ‌ لە دووریت شەیدام

بە بێ تۆ هەرچەند زۆرم لە دەورە ‌ ‌ ‌ بەڵام بە تەنیام

نامەکەت گەیشت نامە سەرچاوم ‌ ‌ ‌ چوو بوو کاسایی

نامەی گەیشتنی هێزو هەناوم ‌ ‌ ‌ کەوتە بینایی

نامەت وەك نوشتە ئەمنایە سەرسەر ‌ ‌ ‌ بە پیرۆزیی فەڕ

ئەمنایە سەر دل ، بۆم ئەبوو بە گول ‌ ‌ ‌ بێ عەترو عەنبەر

ئەمنایە سەرسنگ ئەبوو بە دەرمان ‌ ‌ ‌ بۆ هەموو دەردم

گێڕامیە دوواوە بۆ ڕیزی گەنجان ‌ ‌ ‌ پاكو بێگەردم

ئینجا ئەی گولی نیسانی نەخشین ‌ ‌ ‌ گیانە عیزەدین

نیازم لە لای جیهان ئافەرین[1] ‌ ‌ ‌ کامەرانْ بژین

دوور لە وەیشوومەی شوومی خەزانی ‌ ‌ ‌ بەڵای زستانی

ئاگادارت بێ زاتی یەزدانی ‌ ‌ ‌ ئاشکراو نیهانی

لام وایە دووریت ئەمهێنێتەوە ‌ ‌ ‌ مەیدانی گوفتار

هەستی شاعیریم ئەجوولێنێتەوە ‌ ‌ ‌ بۆت بلێم ئەشعار

پەژموردە بوو بووم کەوتبووم بێحال ‌ ‌ ‌ زمان بوو بوو لال

( یحییها الذي ) ( أول مرة )[2] ‌ ‌ ‌ بمداتێ کەمال

(١) دروستکەری جیهان .

(٢) ئایەتی ( یحیها الذي انشاها اول مرة ) ـ مەبەس خوایە .

خـوا لـەژینـــا بمهێڵێتــــــــەوە
هـەتـا ئـەبینم ئـەگـەڕێتـــــــەوە
دەســـت بە مەشخەڵێ ، نووری حیکمەتێ
لــە کوردســـتانا ، لـە نیشـــتمانا
بـاری دووریی تـۆ لـە سـەر دوو شـانم
بـە هیوای خزمەت بۆ نیشـــــتمانم
کـەمــاڵو مــارف ، کـاوس وەکو تـۆ
هیوای دوا ڕۆژی کوردی کـەســـاسن
فـەرموودەی کــوردی ڕابوردووی زانـا
شـێر لـە بێشـەدا ســـەری دەرهێنـا
شــــێرانە هەڵمەت بدەن بـۆ خزمـــەت
لە خێڵ بەجێماو هـەر تەنیـا ئێمەیـن
بنـەچـەی کــوردم بـۆ بـدۆزنـــەوە
بیدەنـە بـەر شـەق هەڵبەسـتی بوختـان
بزانـن ئێمـەیـن لـــە ڕۆژهــەڵاتـا
نوحو کەشـتیی نوح وا لـــە وولاتـا
گۆتیو کاسـایی ، لۆلۆ ، هەر دوو مـاد
جێگەی شـــــانازیی تیرەی کوردانـن
وورد وورد بگـەڕێن نـامـەخـانـەکـان
هەرچیتان دەس کەوت دەربارەی کوردان
ڕۆژهەڵاتیکان هەمـووی وەك یـەك مـرد

ئـەی نـووری چـاوان
خـــاکی نیشـــتان
وەك بلیمـــــەتێ
دەرخـــەی هیمەتێ
قـورسو گـــران بوو
لـە لام ئـاســـان بوو
ڕۆڵەی ئـەم خـاکـەن
ســـادەی ئـازا کـــەن
بـە نەســــــرین بلێ
چ تێـــــر بێ چ مێ
بـۆ کـوردی نەگبـەت
کـوانێ حـەمیـــەت
لای مێژووناســــــان
تـا هـەمـوو جیهـــان
یـەکـــەم بنچینــــە
وەرە ببینـــــــــە
بـۆم بکەن بـە یـــاد
بـۆچ بچـن بـە بـــاد
بـۆمـــــان دەرێنن
هیـــچ مـەفــەوتێنن
نـەك بـە تەنیـا کورد

هۆزەکانی‌تر کردیان دەس‌و برد — ئیشی خۆیان کرد
سامانی هۆزی خۆیان گیراوە — لە رۆژئاواوە
لە رۆژهەلاتا هەر کوردە ماوە — یانە سووتاوە
باری سەرشانی نەوجوانانە — هەر چەند گرانە
هەولدانی زۆر بۆ ئەم سامانە — هەولی مەردانە
کوردیش بوویەتی ئەدەب یانی وێل — بە تەلەکەو فێل
رووخانیان بینای بە پاچ‌و بەێل — هەتا لێ‌ی بوون وێل
کورم سەیری کەن خاکی نیشتمان — یانی کوردستان
لە دەلیای خەزەر ، هەتا عوبادان — بەهەشتی یەزدان
لە دەشتی رەنگین ، لە چیای نەخشین — خوا پێ‌ی بەخشین
خۆشترین شوێنی سەر رووی زەمین — کورد تیایا ئەژین
باپیرە گەورەی ئێمە یانی کورد — بە تەنیا ئەو مرد
وەجاخی کوێر بوو هاتن دەست‌و برد — زوو میراتیان برد
بەش بەش بوو خاکی وەك گای تالانی — زۆریان بۆ هانی
بێ لانە و یانە منالەکانی — بە سەرگەردانی
بە ووتەی نەستەق نابووژێتەوە — ناجوولێتەوە
کۆششی ئەوێ زیندوو بێتەوە — گرد ببێتەوە
ئەبێ راپەڕن گشت کوردەواری — بە فیداکاری
پشتی یەك بگرن بە مەدەدکاری — تابکرێ چاری
هەر وەك پێویستە بۆ رێی دین تویشوو — لە نوێژو رۆژوو
رێگەی ئازادیش زانیاری ئەوێت — بە گوێرەی مێژوو
ئەگەر مام هەتا ئێوە دێنەوە — پێتان ئەبم شاد
گەر نەمام گیانە خزمەتە لەولاش — من ئەکا ئازاد[٣]

ئابی ١٩٦٠

(٣) ئاشکرایە کە ئەم قەسیدەیە لە شێوەی نامەیەکدا بۆ ئامادەکەری ئەم دیوانە نووسراوە ، کە ئەو کاتە لە مۆسکۆ دەیخوێند .

## بـۆ زانستی[1] ...

— ٥٥ —

له کوردا ئـه‌مـڕۆ حـه‌قیـه‌ زانسـتی
ئه‌گــه‌ر لێ‌بـدا گــه‌زانی هه‌ســـتی
بـه‌ نووری عیلم ، بـه‌ جه‌هـدی تـه‌واو
ڕوونــاکیی عیـلم بـاش ئه‌کـا بڵاو
بـه‌ واســیته‌ی ئه‌و نه‌خوێنده‌واران
زۆریــان چوونـه‌تـه‌ ڕیزی شــاعیران
عیلم واسیته‌ی ئیدراکێو شـــوعوور
عیلمه‌ کــه‌ ئه‌یکا ده‌ماخ پـڕ لـه‌ نوور
ســا خوا پـڕ کـه‌ی ده‌مـاخی کوردان
لـه‌ عیلم و دانش حیکمه‌ت و عیـرفـان

(١) ئه‌م شیعرانه‌ له‌گه‌ڵ ووتارێکدا له‌ کۆبوونه‌وه‌یه‌کی زانستیدا ســـالی ١٩٢٨ خوێندراوه‌ته‌وه‌ .



## نیشـــــــتمان

نیشـــــــتمانی جوانی کوردســــــتان
بــه چیـــاو ســــەبزەزارو سەر کـانی
تۆ بەهەشـــتێکی خۆشــــــی یەزدانی
وێنــەی تــۆ نی‌یــه لـــه ڕوویی جیهان

لــه هــەمــوو لاوه بۆچ دەسی زۆردار
بــه دەســیسـه و بــه حیـلەوو جـادوو
کـــەوتــه نـاو تۆوه دوژمنی بـەد خوو
پێی نەهێشـــتی هەبوو کەس‌و ســەردار

بەش بەش‌و پـارچـه پارچەیـــان کردی
شــــادە هەرکەس کەوا وەریگرت بەش
وەتـەنـم ئیمرۆ بوویتـه مولکی حەبەش
وا ئـەزانـن تـــەواوەتی مــــــــردی

نـامـرێ تیرەیی بــه هـۆش‌و بــه فـام
ئـەو کەســـــانەی هەیانـه وا کەلکێ
ڕۆژێ دێ گشـــتی پێـکەوه ئـەلـکێ
دێتــەوه کـایــه بـۆ هیــواو ئەنجـــام

ڕاســـتی ئیش ئـەکـا نەوەك بە گەزاف
دلــه ، ئـەبێ ســــرەوت‌و نـاســرەوێ
( ســەفوەتا ) من حقووقی کوردم ئەوێ
مێزەرم نێن لـه مل لـه جێی تـەنـاف

پیــری ژیـری ژیــن[1] بولبولی باغـم
دەمێکە بـە خــوا جــگەر بـە داغـم
ڕووی بــە ڕۆژوو بــووم وەختێ ئێوارە
زەردبــووە گــۆنـام لێــوم بـەبـارە
ســـەرخۆشی بـادەی ڕۆژی ڕەمـــەزان
ڕۆژئـاوا ئەکـەم ئەڕوانمە شـــاخان
هاتــوچۆ ئەکـەم ، نەشـئەیی مەســتی
خســـتمیە باغچـەی گولزاری هەســتی
گولـزاری هیــواو ئــاواتی دێــریــن
هــاتـە بـەر چـاوم شــیرینو ڕەنگین
گولـەو ڕێحـــانـە خـەرمـانـەی داوە
عەرعـەر وەك بـالآی دولبــەر وەستاوە
شـــۆڕەبیی هیــوا بـا ئەیشـــــەکێنێ
ئـەو دەســـتە بیــرن لقی ئەشـــکێنێ
بـاغو بـاغـــاتو مێــرگو میرغــوزار
چیمەنی نەخشـــین ســـەرو و لالەزار
نەك دلێ بە ( لەك )[2] ، دل ئەبێ حەیران
یـا خوا بـە خێر بێت مانگی ڕەمـەزان
وا هێنـاتـەدەر شـــیمەی نەســابەت
کردتـەوە بۆ من قـاپیی کـــەرامـەت
گولزاری هیــوای ڕۆژی دوایی کورد
خســـتە بەرچـاوم وەهـا دەستو برد
ڕۆیشـــــــتم گـەڕام بـە نـاو گولانـا

(١) دیارە مەبەس پیرەمێردی شاعیرە .
(٢) لـەك : هەزاران .

لەنجەولار ئەکەم بە ناو پێستانا
بە نەشئەو خۆشی وا تیا ئەکەم گەشت
پاداشی ڕۆژووم هاتوومە بەهەشت
بەهەشتە ئەمە ، یا سەرچنارە
لەبەر چاوی من وەها دیارە
لە دامێنی گرد ، بەربەست کرابوو
دەریاچەیەك بوو دروست کرابوو
سەد دوو سەد بەلەم وا لەسەر ئاوە
هەندێ ئەگەڕێت ، هەندی وەستاوە
یلاتی کوردی وا لە سەرچنار
لەسەر یلاتان ئەکا ئیفتیخار
پایتەختی کوردە وا سلێمانی
زیندووبۆتەوە دەوری بابانی
لە قاپیی یلات جووتێ یاساوڵ
چەك بە دەستەوە فیشەکدان لە مل
بە هەر جۆرێ بوو چوومە نزیکیان
لە چاکی بەختم چابوو ناسیمیان
گەورەی یلاتە پێشەوای وولات
چوومە خزمەتی بێ نیشانەو کارت
ووتم پێشەوا گیانی شیرینم
پایتەختی شایی کوردم بینم
لەگەڵ پێشەوا چوومە سەراوە
تیپی تایبەتیی شایی وەستاوە
چ تیپێ تیپی هەموو دلاوەر

ڕانك و چۆغەی زازایی لەبەر
لە هەر تیرەیە تایبەتی چەند لاو
تیپی تایبەتیی پێ کرا بوو تەواو
بەم جۆرە عەسکەر بەم وێنەو تەرزە
نەمدیبوو ئازام گشت کەوتە لەرزە
هێزم دایە خۆم جا بە ئازایی
ڕووم کردە ژووری تایبەتیی شایی[٢]

(٢) من ئەم پارچەیەم بە منداڵی دیبوو ، لەسەر چەند کاغەزێك نووسرابۆوە . بە داخەوە هەر یەك لاپەڕەی دۆزرایەوە . شیعرەکان کۆنن ، بۆ بلێی باسی، پێشەوا ، باسی مەهابادی خوێنین نەبێ ؟

— ٥٨ —

## بۆ ئەمین زەکی بەگ[١] ...

هەمدیسان کەوتەوانێ کۆسی کورد
پێشەوامان ئەمین زەکی بەگ مرد
کوردی بێکەس بە چی بێ بە تەما
پێشەوایێکی بوو ، ئەویشی نەما

(١) کتێبی « یادی کۆچی ئەمین زەکی . بەغدا ، ١٩٤٨ » ووتارێکی ( سەفوەت )ی تێدایە کە لە کۆڕی چلەی ئەمین زەکی بەگدا لە سلێمانی خوێندراوەتەوە . ووتارەکە بەخشانە ، بەڵام لە سەرەتاو ناوەڕاستو کۆتاییدا سێ پارچە شیعری تێدایەو تێهەڵکێشی پەخشانەکە کراون . لێرەدا شیعرەکانمان تۆمار کردەوە .

ڕێ‌یەکی گشـــتی‌یەو نی‌یـە چـارە
ئەگینـا شـــانی کـــوردو ئـەم بـارە
بـاری وا پشـــتی قەومێ ئەشـــکێنێ
بـاری وا کێـو و کـەژ ئـەڕووخێنێ
خـوا بـە غوفرانی ئـەو بکا دلشــاد
هۆزەکـەیشـی لـە بـەنــد بێ ئـازاد
زۆر بـە تەئریخـەکەی دلـم شــادە
کـە ڕەزای ڕەببی بـۆ بـوو ئـامادە
( رضی الـرب عنــه ) بێ هــەمـــزە
هیجرەتی پێشـــەوایی سـەربەرزە
۱۳٦۷ = ۱۲٥ + ۲۳۲ + ۱۰۱۰

## ٥۹

نیشـــتمان زەمین ، ئینســـان برایـە
لــە بـاوکی ئـادەم ، دایکی حـەوایـە
ئەگـەر بـە بـرا یـەکتـــر بناســین
ئیتر بـۆچ ئەبێ ئـەم گشـت هـەرایـە
ئەمەی من ئەیلێم بێ شـــوبهەو گومان
فەرمـانو ئـەمـری ڕەســوولوللایـە

له دووریی تۆ زەکی بەگ دڵ سووتاوا(١)
هەموو کوردێ هەناسەی لێبڕاوا
شکا پشتو بڕا هێزی دوو ئەژنۆ
لە گریەن ، پیر هەتا مندالی ساوا
ئەوەندە نیشتمانیش جەرگی سووتا
لە سەرچاوەی نەما ئاو وەك لە چاوا
ئەمانە دەردی دووریتن وەئیللا
نەمردوویت ، زیندویت ، هەر وای لە ناوا
هەتا ڕۆژی سەما تیشکی ئەمێنێ
هەتا ئەم سەر زەمینە مابێ ئاوا
خەیالت هەیکەلێکی یادگارە
لە نێو ساحەی دلی هەر پیرو لاوا
لە فکرم پرسی تەئریخی وەفاتی
ووتی پێم : نیشتمان پەروەر نەماوا
١٣٦٨ = ٩٨ + ٤١٨ + ٨٥١

(١) دیارە یا نارەزووی یەکخستنی قافیەی هەموو پارچەکە یا تەئریخەکەی دورا دێڕ وای لە شاعیر کردووە کە لە دێری یەکەمو دووا نیو دێڕدا ( ئەلف ) بخاتە جێی ( هێ ) . جا نازانم بۆ کوردی دەگونجێ ( ئەلفی ئیتلاق ) ، وەك شیعری عەرەبی لە کۆتاییدا دابنرێ ، یا بە ناوی ( ئیشباع )ەوە ( هێ ) بکرێ بە ( ئەلف ) ، یا هەر زاڵ نەبوونە بەسەر تەئریخ دەرهێناندا . بە هەموو بارێکدا وامان بە باش زانی کە ئەم پارچەیەش تۆمار بکەین ، بە تایبەتی کە ناوەرۆکەکەی بایەخی تایبەتی‌ی هەیە . ( ع )

## - ٦١ -

بە تەزویرو دوعا تەسخیری ئەو شۆخە چ ئیمکانە
خەیالی خاوە عەنقا ناکەوێتە داوی ئەفسانە[١]

## - ٦٢ -

سوئالم کرد کە چین بەربوونەوە ، ئەو نەحسی قیرسچمە
دوو لفکەی دا بە یەکدا کاکە شێخ قادر ووتی لچمە[٢]

## - ٦٣ -

چواردە سالە شێت و شەیدای چاوی تۆم
بەم هەموو دەردە ژیاوی ناوی تۆم[٣]

(١) ئەم تاکە بە خەتی شاعیر نووسرابۆوە ، نیوەی یەکەمی شیعری مەحویە ، نیوەی دووەمم نەدۆزیەوە ، ڕەنگە هەر تێهەلکێشی خۆی بێت .

(٢) لە بەرگی فەرهەنگێکی ( المنجد )دا ئەم دێڕەش بە خەتی شاعیر نووسرابۆوە ، ڕەنگە ئەمیش هەر شیعری خۆی بێت . چونکە لە دیوانیتردا نەمدیبووە .

(٣) لە بەرگی ژمارە ٦ی سالی ٨ ، حەزیرانی ١٩٤٧ی گۆڤاری ( گەلاوێژ )ی نووسیوەتەوە .

\- ٦٤ -

## هۆنراوەی کوردی

## لە دوڕی بوردی

شاعیر دەیگێڕایەوە . دەیووت : فەقێی سلێمانی شەوانی جومعە لـــە مزگەوتی گەورە کۆدەبوونەوە قەسیدەی بوردیەی بووســـیری‌یان بـەو چەشنە دەخوێندەوە کە لە کوردستاندا باوە • زۆرم لا خۆش بوو کـە ئەم قەسیدەیە بە کوردی بخوێنرێتەوە ، لەبەر ئەوە دێڕ بـە دێڕ لەسەر وەزن و ڕەویی خۆی کردم بە کوردی •

ئەوە بوو ئەو وەرگێڕانە سالی ١٩٣٥ چاپکراو لە زۆر شـــوێنی ووڵاتدا بڵاو بۆوە ، لە سلێـانی نەبێ ، کە شتی خۆمالی لای هاوەڵان نرخی نیە ، لەبەر نرخی مێژوویی ئەم وەرگێڕانە ، وا چاپمان کـردەوە • بـەڵام دەبێ ئەوەندە بلێین ، کە شاعیر جارێکی‌تر ، پاش چاپ دەســتکاری‌یەکی

کەمی وەرگێڕانەکەی کردووە • چونکە هەندێك دەستکاریمان لەسەر نوسخەیەکی چاپکراوبینی ، هەر وەك لە پاڵ وەرگێڕانی ( بانت سعاد )دا کە سالی ١٩٤٩ کراوە ، جارێکیتر ئەم بوردەیە نووسراوەتەوە کە جیاوازییەکی کەمی بەرەو کوردیتری تێدایەو ئێمەش لە چاپکردنەوەدا ئەوەمان ڕەچاو کرد •

( ع • م )

**شاعیر ئەم چەند دێرەی لە چاپی یەکەمی قەسیدەکەدا نووسیووە ..**

بڕێژە ڕەحمەت خوا بە دائیمی تا ئەبەد
سەر خۆشەویستت کە چاترینی خەلقە بەجەم[1]

ئەبێ لە نێوانی هەر دوو شیعرێکا ئەمە بخوێنرێتەوە ، چونکە :

بەیانیان کردووە ئیمامی ( غەزنەوی ) هەمرو شەوی جومعەیەك ئەیخوێند بۆ ئەوەی بە خزمەتی حەزرەت بگا ، نەیەدی ، لە لایەن مورشیدێکەوە پێی وترا بەم جۆرە بیخوێنە بە خزمەتی ئەگەی • خۆم کە ئەم دوڕانەم هۆنیەوە ، شەوێکی جومعە بەم جۆرە خوێندمەوە ، بە خزمەت کامەران بووم ، قەسیدەکەم خوێندەوەو ئەسەری قبوولم وەرگرت •

**مودەڕیسی مزگەوتی باشچاوەش لە سلێمانی**
**حاجی مەلا ڕەسوول زادە**
**مەلا مستەفا سەفوەت**

---

(١) خوێندنەوەی ئەم قەسیدەیە لە ڕووی کێشەوە زۆر تر بەو جەشنە لەنگێتی ڕاستدەبێتەوە . کە وەك خوێندنەوەی قەسیدەی بوردەی ناو کوردان بخوێنرێتەوە . ( ع )

## هـاواری عەشـــق

لـــە یادی هەمـــایەکەی دانیشتوویی زی سـەلەم
فرمێـــکت کرد تێکەلی خوێنێ کـە ئەڕژا لە چەم
یـا بـایـە بوو هاتبوو لـە لای مەدینـەی ڕەسـوول
یا بەرقی ڕوون بوو لـە تاریکی لـە شـــاخی ئیزەم[٢]
ئەی بۆ دوو چاووت بلێیت مەگرین ئەوان زیاد ئەکەن
دل بۆچ بلێیت پێی بەسە زیاتر ئەبێ پـڕ لـە هەم
ئـایـا وەها تێ ئەگـا عاشـــق کـە پەنهـان ئـەبێ
حوببی لـــە بەینی دلی شـــێواو و چاوی بـە نەم
ئینکاری عەشق چۆن ئەکەی لە دوای ئەوەی شاهیدن
لەســەر تۆدا خورڕۆمی فرمێـــکی چـاو و ســەقەم
بەبێ عەشق نەت ئەڕژت فرمێـــکت سەر جێ هـەوار
و نەت ئەرژت هەم دیـسان ، لـە یادی بانو عەلـەم
داینـا عەشـق دوو خەتی فرمێـــکو غەم هەر وەکو
شـــیلانو گول ئاشـــکرایە وا لـەســـەر دوو کولم
بەلێ خـەبـەرداری کـردم یـاری مەحبووبـەکـەم
مەحەبەتی تـۆ ئـەکـا تێکەل بـە خۆشی ، ئـەلـەم
ئەی لۆمەکـەرم لـە عەشـــقی عوزریـا مەعزەرەت
ئینـــافت بیوایـە تـۆ نەتدەگرت لۆمـەو لـەقـەم
گەیشـــــتە تۆ حالی من ، نیهانیی من نابێ وون
لـە لۆمەگر هەر وەکـو دوایی نییـە دەردەکـــەم
ئامۆژگـاریت پـاکـە تـۆ ، بەلام ئـەمن نـاییـەم
گرانـە گوێی عاشـــقان ، لە لۆمەی ئەهلی لەقـەم
پیری نەســـیحەت ئەکـا ، من تومـەتی پێ ئەکەم
پیری لـە نوسحی خۆیـا دوورە لـە درۆ و تومـەم

(٢) اضـم .

# خۆپاراستن لە ئارەزووی نەفس

ئـەم نەفـــی ئەممارەیـە نەفـامـە گـویٚ ناگریٚ
لـە ترســی ترسێنەری پیریو ســپی ڕیشـــەکەم
هیچ خۆی ئامادە نـەکـرد ، بە کردوەوی چاکە بۆ
مێوانـە هاتـە ســـەرم لـە لای نـەبوو موحتەرەم
بمزانیـایـە ئـەگـەر من حورمـەتی نـاگـــــرم
خەنەم ئەکرد مووی سپی ، وونبیٚ ، نەبینریٚ بە چەم
کیٚ بـۆم بگێڕێتەوە نەفـــــــم لە گومڕاییدیـا
وەك ئەسپی ســـەرکەش کـەوا لغـاوی بکرێتـە دەم
هیوات نەبیٚ شــەهوەتی نەفـت بە عـیان شکان
خۆراك کە زۆرتر ئەدا قوەت بە گـەورە شـــکەم[1]
وێنـەی منالـە نەفس ، گەر لێی‌گەڕێت زل ئـەبیٚ
لەســــەر مـەمـك بیبڕەوە نـابینی بۆی بێنیٚ دەم
لایـدە هـــەوایی نەفس ، وریـا بـە ئـامیر نـەبیٚ
کـە بوو بـە ئامیر ، هـەوا ئەتخاتـە ڕەنجو سەدەم
وریـای بـە کەوتـە لەوەڕ لـە کاتی ســـەرداریـا
دەمی کـــە شیرین بوو لێی بۆت ناگیریٚ بیٚ ســتەم
چەند جوان ئەکا لەززەتی کوشـــندە بـۆ ئـادەمی
جۆریٚ نـەزانی هـەیـە ، لـە چەوریـا زەهرو سـەم
ترسی دەسیـەت بیٚ لـە برســـێتیو تێـریـیـا

(١) گەورەشکەم : وورگ زل .

برسێتی زۆره خراپتر بی لـه تیری شـــکەم
برێـژه فرمێســـکی خـورِ لـه چاوێ وا پڕ بووه
بێ دینی جا دانیشـــه ئەوسا لـه دەرگای نـەدەم
موخالەفەی نەفس و شـەیتان کەو لێیان وەرگەڕێ
نەسـیحەتت گـەر ئەکەن ، بیانکه تـۆ موتتەهـەم
ئیتـاعـەیـان هیچ نـەکـەی بـه موددەعی و حاکمی
کـەتـۆی ئـەزانی دەسیـەی موددەعی یـا حەکـەم
داوا ئەکـەم عـەفوی حـەق لـه قەولی بێ کـردەوه
هـەر وەك منـالی نەزۆکـه نیسبەتی ئـەم قـەم
چاکیم ئەمر کرد بـه تـۆ ، خۆم کردەوەم پێ نەکرد
ڕاســتیم نەبوو چۆن ئەبێ بۆ تۆ به ڕاستیی قـەم
ڕێکم نەخـســت زادی سـونەت من لـه پێش مردنا
قەرز نەبێ نوێژو ڕۆژووم بـۆ نـه هاتن بــه هـەم

## بەندی سێیەم

### ستایشی
### پێغەمبەر (ص)

تەرکی ڕەوشـــتی کەسێکم کرد کـه ئیحیای ئەکرد
تاریکیی شـــەو تـا دوو پێی شکاتی کرد له وەرەم
بەردی لەســەر زگ ئەبەست نەبی لـه برســـێتی‌یا
خەرجی ئەکــرد بۆ خوا دینــاری چی بوو درەم
کێوان به ئالتوون ئەبوون ، خۆیان لەبەردەست ئەنا

ڕووی وەر ئەگێڕا لێیان ساحێبی خولقو شــەمەم
نەبوونی چۆن ئــەو کەســــە ئەخاتــە دنیا کــە ئەو
نەبوایــە دنیا ئەبەد نــە ئەچووە دەر لـــە عـــەدەم
موحەممەدە گــەورەیی دنیــاو و دین ، ئینس و جن
گەورەی دوو فیرقــە ئەوە لــە عارەبو لــە عەجــەم
پێغــەمبــەری ئێمەیــە فــەرمـــان دەرو نــاهیــە
ڕاستتر نیــە لەو ، کەسێ لە قەولی ( لا ) یا ( نەعەم )
هــەروا حەبیبێــکە مــەئسولــە شــەفاعــەتی ئــەو
بۆ هــەر بەلاو ترسێ دابگرێ هەموو کەس بــە عەم
بۆ لای خــوا بانگ ئەکا دەســـــگر بــە دامانی ئــەو
دەســگیر بە پەیمانی بوون ، هەڵناوەشێ زۆرو کەم
بەرزتری ئەنبیــا لەشـــێوەو و هــەم سروشــت
نزیکی ئەو ناکەون لــە وەســـفی عیــلمو کــەرەم
داوا ئەکــەن گشـــتیان ، لە تۆ ڕەســوولی خوا
لوێچێ لـــە دەلیای عیلم ، پرشـــنگی ئاوی کەرەم
لە جێی خۆیان ئەنبیا وەســتان لــە خزمەت ئــەوا
لــە نوختــەیێــکی عیــلم ، وە یــا لــە شکلی حەکەم
تەنیــا ئــەوە وا تــەواو بوو سیرەتو ســـوورەتی
جــا کردی یە خۆشەویست پەروەردگاری نیـــــەم[1]
پاکە لــە هاوبــەش لــە جوانی خۆیو جا جەوهەری
حوسنو جەمالی ئــەبــەد ناکا قبوولی قەســـــەم
ئەوەی کــە گــاور لــە عیــــادا ئەڵێ مەیلێ تــۆ

(١) نیــەم ، نسم ، انفس ،

چی مەیـل ئەکـەی بیلێ بۆ مەدحی رەسوولی ئومەم
نیسبەت بدە زاتی ئەو چی مەیل ئەکەی بۆ شەرەف
نیسبەت بدە قەدری ئەو چی مەیل ئەکەی بۆ عیزەم
فەزلی رەســــــوولی خوا بڕانـەوەی بـۆ نی یە
بتوانێ بـاســــی بکا کەسێ بـە نوتقو بــە دەم
میقـداری قـەدری بلـندی موعجیـزەی بێتـە ڕوو
زیندوو ئەکا ناوی پێی بانگ بکەی مردووی قیدەم
تاقیی نەکردووینەوە بــە ئیشـــی دووری عـەقـڵ
ئێمەی ئەوەند ویـستووە نـەمـانبێ شوبهەوو هەم
لـە فەهمی مەعنایی ئـەو عـالـەم هیـلاکن هەموو
لـە دوورو نزدیـك کوڵە تیغی شــــعور و فەهم
وەك ڕۆژە سەیری ئەکەی بچووك ئەبینرێ لە دوور
شــەوقی لـە نزدیکەوە دێنێتـە ســـەرچاوت تەم
حەقیقەتی ئەو لـە دنیـا قەومی چۆن تێ ئـەگـەن
نووسـتوونو قانیع بوو ون لـە زاتی ئەو بە وەهەم
ئەوەنـدە ئەنـدازەیی عیلمە کـە ئەو بەشــــەرە[٢]
وە چاترینی هـەمـوو خەلقی خوایــە بــە جـەم
چیـیـان هێنـا موعجیـزە پێغەمبـەرانی خـــوا
لـە نووری ئـەم بوو کـەوا پێیـان کرا بوو کەرەم
ئەم ڕۆژی فەزڵـە ، ئەوانیش گشـتی ئەستێرەین
کە دەریان خست تیشکی ئەم، بۆگشت جیهان لەناو تەم
هەتا تلووعی لــە کـەونـا کـــردو دایگرتــەوە
هیدایـەتی عـالـەمێو کردیـوە زینـدوو ئومـەم

(٢) واتە : عیلم هەر ئەوەندەی پێزانراوە .

گـەورە سروشـتە نەبی . شـێوەشی هـەر وا بڵند
جوانی تەواوی هەیە . ڕوو خۆشە ئـەو ڕەهبـەرەم
وەك مانگی چواردە بـە نوورە ؛ نازکـە وەکو گوڵ
وێنەی زەمـان هیـەتی دەریایەکـە بۆ کـەرەم
بـە تاقی تەنیـا کـە تووشی بی لـەبـەر هـەیـەتی
وا تێئەگـەی وا لەگەڵ ئۆردو و سوپاو و حەشـەم
بـە چەشـنی ئەو لوئلوئەی لـە ناو سـەدەف دانرێ
وتـارە پیـرۆزەکـەی کـە دانراوە لـە دەم
هیـچ بـۆنێ نـاگـا بـە خـاکێ وا بـە ئەندامیەوە
تووبا[٣] بەشی ئەو کەسە ، ئەو خاکە ماچ کا بە دەم

(٣) تووبا ـ طوبی . درەختێکە لە بەهەشـت ، بە مەعنا ـ خۆزگـە ـ یا بەختەوەرە ئەو کەسە بەکاردێت .

## بەندی چوارەم

### لە دایکبوونی پێغەمبەر (ص)

کـاتێ لـە دایـك ئـەبوو بۆنی ئـەهـات ڕەگـەزی
لـەو بۆنـە خۆشە کـە بووی لـە سـەرەتاو موختەتەم
ڕۆژێ بـوو لـەو ڕۆژەدا فـورس هـەمـوو تێگـەیین

کە ترسیان کەوتە بەر بە هاتنی دەردو غەم
هەیوانی کیسرا ڕما وەك کۆمەڵی لەشکری
جۆرێ بڵاو بوو سوپای نەبووەوە بۆی موتەزەم
کوژایەوە ئاگری مەجووس‌و نەیسا نەفەس
لە دەوری ئەگری فوڕات ، بە دڵ حەزینی‌و نەدەم
عاجز بوو ( ساوە ) کە ڕۆ چوو ئاوی دەریاچەکەی
ئەهاتنەوە تینووەکانی دل بە قین ، ووشك دەم
جێ ئاگرت سەیر ئەکرد تەڕ بوو وەکو جێگە ئاو
جێ ئاوەکەت سەیر ئەکرد بوو بوو بە تەنووری گەرم
ئەجنە موژدەی ئەدا شوعلەی ئەدا نووری حەق
لە قەول‌و مەعناکەدا وا دەر ئەکەوت دەمبەدەم
کوێربوون‌و کەڕ بوون نەیانبیست هیچ بەشارەتی ئەو
نەبینرا بەرقی تەبلیغاتی پڕ ترس‌و غەم
لە دوای ئەوەی کاهینان بە قەومی خۆیان گەیان
کە دینی کەچیان نەما کەوتنە هیلاکی‌و سەدەم
لە دوای ئەوەی وا دیان بلێسەی ئاسۆ ئەهات
رووەو زەمین هەر وەکو چی بوو لە ئەردا سەنەم
تاکو لە ڕێگەی وەحی شەیتانان ئاوارە بوون
وا یەك لە دوای یەك ئەسووتێن تا بە شوعلەیی گەرم
وەك پالەوانانی ئەبرەهەن لە ڕاکردنا
یا لەشکرێ بەردی تێ گرتن ئەبیی موحتەرەم
بەردێ لە دوو دەستی ئەو تەسبیحی کرد هەر وەکو
تەسبیحی یونس لە ناو ماسی ، لە ناو قوولییەم

## موعجیزاتی پێغەمبەر

لـە حالی سـوجدە درەخت ئەهات لـە بۆ دەعوەتی
لەســـەر پێ‌یەك وا ئەچوونـە خـزمـەتی بێ قـەدەم
ڕەگ‌و دەمـــاری ئەلێیت نووسیویە دێڕێ چلۆن
نووسـینی خەتێکی خۆش بە جوانترینی قـەلـــەم
وەك هەورەکەی ئەچووە هەر جێ‌یە بەسەر سەریەوە
حیفزی ئەکرد هاوینـــان لـــە تین‌و تـاوی گـــەرم
سوێندم بەو مانگە بـە پەنجەی بوو بە دوو کەرتەوە
وەکـو دلی حـەزرەتێ بـــە ڕاستترینی قەســـەم
بـەوەی کـە لەو غـارەدا لـە خێرو هـەم لە کەرەم
چی چاوی کافر بوو لێی کوێـر بوو بە تانەو بە تەم[1]
ڕەســـوول‌و صدديق لـە غارا مانەوە و گـــاوران
ئەیانووت ئـەم غـارە چۆلـە چـاویـان گرتی تـەم
وا تێ‌گـەیین کۆتـرو جـالجـالۆکـــە نـاهـۆنـن
هێـلانـە نـاکەن لـە دەرگای غاری چاکان بە جەم[2]
پاراستنی خوا کـــە بوو پێویسـت نی‌یە بۆ کەسێ
زرێی دوو هەلقـە ، وەیـا قەلای بلند و حەشـــەم
زولمی زەمانم نـەدی ، پـەنـــام کـــە بۆ بـرد بێ
کـەوتوومـە ئیـسراحـەت‌و پەنایـە کـەوتـە دەسم

(١) غـاری پێغەمبەر .
(٢) لە چاپکراوەکەدا ئەم دێڕە کوردی‌یە زیاد کراوە :
**ئەیوت ڕەســوولی خوا مەترسە ئەی ( بووبەکر )**
**لـەم غـارەدا ئێمە دووانین‌و خوایــە سێ‌یەم**

چیم داوا کرد دەولـەتو ســامانی دنیــاو و دین
هەلبـەت دەسم کەوتووە لـە چاکتر ئەهلی کـەرەم
ئینکاری وەحی لـە خەو ، مەکـە ، دلێـکی بـووە
نوســتوو بێ دوو چاوی دڵ ، وریا بووە موحتەرەم
ئەمـــەی ئـەلێم حـالـەتی بـوو ئـەوەلی ناردنی
ئینــکاری نـاکـرێ لـە دوای ناردنی ئەو بۆ ئومەم
چەند خێری زۆرە خـوا وەحیی بـە کەســبی نییە
نەبێ لـــە غـەیبی خـوادا نـاکـرێت موتـەهــەم
بـە پیـاهێنـانی دەسی چەندی شـیفا بوو نەخۆش
بەربوو لـە بەندی جنوون ، نەیما نە زۆر و نە کـەم
زیندووی ئەکرد ســـالی قاتی دەعوەتی وات ئەدی
ســەوز ئەبوو ســـەر زەمین بە چەشنی باغی ئیرەم
بـە هـەوری بـارانی وا هەتـا خەیاڵت ئـەکـــرد
مەککە شـــــەپۆلی یەمە یـا بۆتـە سـەیلی عەریم
تۆ لێم گـەڕێ ڕێـکی خـەم ئایاتی ڕووناکی ئـەو
وەك ئـاگـری میـوانـداری لەبـان کێـو و عەلەم[٣]
دوور زیـاد ئـەبێ شـــەوکەتی ، لە کاتی هونراوەیی
ئەگەرچی نەیهۆنیـەوە بـایـەخی هیچ نـابێ کـــەم
چیریـە هیوای من لـە بـۆ تـەواوی مـەدحـم لەبۆ
ئەوســـافی ئـەو زاتـە وا هـەیـە لە خولق و شیەم

(٣) عەلەم : هەر کێوە ، ئاگر بۆ میوان ڕووناکردن دەکرێتەوە .

## قورئان

لە لای خواوە کە هات ئایاتی حەق حادیسە
قەدیمە چون وەسفە بۆ ، کەسێ هەیەتی قیدەم
بە ڕابەری هیچ نییە بە هیچ زەمانێ کەچی
ئێمە خەبەردار ئەکا لە حەشرو عاد و ئیرەم
بەرزتری موعجیزەی پێغەمبەرانی خوا
لای ئێمە باقی بوو ئەم ئەوان نەمان بۆ ئومەم
ئایاتی ڕوونە نەیانهێشت شوبهەیەك بۆ کەسێ
وە هەم نەیانهێشتووە ڕێگایی ئەهلی حەکەم
نەکراوە جەنگێ ئەبەد مەگەر گەڕاوەتەوە
گەردن کەچی حوکمی بوو دوشمنترینی خەسم
بەلاغەتی کپ کەری دەعوا بوو لای ڕەخنەگر
وەك ئەهلی غیرەت دەسی جانی لە ماڵو حەرەم
لە زیادیا وەك شەپۆلی بەحرە مەعنایی ئەو
یا ژوورتری جەوهەری بەحرە لە جوانیو قیەم
ژمارەیی ناکرێ عەجایەبی ئایەتی
خوێنەر لە زۆر خوێندنی نابینێ ڕەنجو ئەلەم
ڕووناك ئەبێ چاوی خوێنەر من وونم دەستکەوت
زەفەر بە عەهدی خوا بەری مەدە زۆرو کەم
بیخوێنی گەر تۆ لە ترسی گەرمیی ئاگر ئەوا
بە ئاوی ساردی کوژاتەوە بڵێسەیی گەرم
وەك حەوزێکە ڕووی گوناهباران سپیکاتەوە
لە ئاگرا هاتبن سووتاو و ڕەش وەك فەحم[1]

(1) یا : « هاتوون ڕوویان ڕەش بووە ، ڕەشی بە وێنەی فەحم » .

لە ڕاستیا وێنەیی میزانە یا وەك سیرات
لە غەیری ئەو کەی هەیە عەدالەت وە یا حەکەم
سەرسام مەبە گەر حەسوودێ ڕێگەی ئینکاری گرت
خۆی گێل ئەکا وەر نێ ئەو وریایە خاوەن فەهم
لەبەر تەمە هەندێ چاو ڕووناکیی ڕۆژ نابینێ
ئاو تامی نابێ لەبەر نەخۆشی لای هەندێ دەم
ئەی چاترین کەس کە دێن بۆ مالّی ئەو سائیلان
بە سواریی ئوشتری خۆش ڕەو کە دێنە حەرەم
ئەی ئەو کەسەی ئایەتی گەورەی لە بۆ موعتەبەر
بۆ ئەهلی فرسەت کە تۆی گەورەترینی نیعەم

## بەندی حەوتەم

### میعراجی پێغەمبەر (ص)

لە کەعبەوە چووی بە شەو تاکو بەیتولموقەددەس
وەك ڕۆینی مانگی چواردەی شەو لە تار و زەلەم
بۆ قابەقەوسەین بلند بوویت وا هەتا پایەیە
کە قەسدی نەکراو نەزانراوە بە هیچ وەختێ دەم[1]
پێغەمبەران پێش خۆیان خستی لە بەیتولقودس
بە چەشنی پێشخستنی گەورە لە باقیی خەدەم

(1) یا : « نەگەیە ئەو پایەیە کەسێ لە هیچ وەختێ دەم » .

حەوت ئاسمانت بڕی تۆ بەو ڕەسوولانەوە
لە کۆمەڵێکا کە بووی خاوەنی ئالآ و عەلەم
هەتاکو لێ نەگەڕای جێگەیە بۆ هیچ کەسێ
نزیکیی و بەرزی هیچ بۆ پێشەوایی ئومەم
بە پایەی خۆت نزمت کرد مەقامی هەرکەس هەبوو
کە بانگکرای تۆ بە تەنیا فەرموو مەحبووبەکەم
هەتاکو نایل ببیت بە وەسڵی هەر سڕی حەق
ئەسراری وون بوو لە چاوو هەر شتی موکتەتەم
تەنیا دەست کەوت هەموو فەخرو تەجاوزت کرد
لە هەر مەقامێ کە بوو بێ زەحمەت و بێ ئەلەم
قەدری گەلێ گەورەیە ئەو ڕوتبەیەی پێت درا
کەمێک ئەزانرێ ئەوەی کە پێت درا لە نیعەم
موژدە موسوڵمانەکان هەمانە پاڵ پشتی وا
ڕوخانی نایەتە سەر لە لوتف و فەزڵ و کەرەم
بە چاترینی ڕەسووڵ ، ئەحمەد خوا بانگی کرد
لەبەر ئەوە ئێمە بووینە چاترینی ئومەم

## بەندی هەشتەم

### غەزای پێغەمبەر (ص)

لەرزی دڵی دوشمنی بە بیستنی ناردنی
وەک مەڕ لە ناکاو لە شێر کە بیبێ دەنگ و نەغەم
تووشیان ئەبوو هەر شەڕێ وەکو قەنارەت[1] ئەدی

(1) مەبەس قەنارەی قەسابە .

هەر پارچە گۆشــتە ئەوا ، ئالاوەتـە شیر و ڕم
فیراریـان پێ خۆشـبوو وا نزیك بوو خۆزگە بخۆن
بـە پارچە گۆشتێ کە بیگرێ بازو سیسارگ بە دەم
شـــەوان ئەڕۆین نەیانئەزانی چەندە مەگـــەر
لـە مانگێ بووایە کـە مەشهوورە بە شەهرولحەرەم[۲]
دیـن وەك میوانـــە کـــە دابەزێ لـە خاکی ئەوان
هەر گەورە پڕ ئارەزوو بۆ گۆشتی دوشمن[۳] بە عەم
ســوپای ئەهێنا ڕەسوول ، ئەسپ سووار وەك بەحر
لـە پالـەوانـان شـەپۆل ئـەیگرتێ پـڕ ســتەم[٤]
هەموو ژمێرراوی حـەق ، دڵ پـڕ ســەوابی خوا
هەلمەت ئەدەن هەلکەنن ، ڕەگی کوفر پـڕ ستەم
هەتاکـو ئیســلامیەت لـە سایەی ئەســحابـەوە
دوای غەریبی هاتـەوە بەجێی هێنـــاوە ڕەحـــم
بە چاتری باوك و مێرد ، دین وا لـە ژێـر ســایەدا
نابێ هەتیو ، بێوەژن ئەمێنێ هـــەر موحتـــەرەم
ئەوە چیـاکـــان لێیـان پرســـە لە جەنگی ئەوان
چیان لەوان دیتـووە لـــە هەلمەتی پـڕ ســـتەم

(۲) چوار مانگی زیلقەعدەو زیلحەجەو موحەڕەم و ڕەجەب ، کـە بـە پێی ئاینی ئیسلام کوشتاریان تێدا قەدەغەیە .

(۳) ووشە عەرەبی‌یەکە ( قرم )ە بە مانا حەریس بۆ گۆشت خواردن .

(٤) لە نوسخە چاپکراوەکەدا ئەم نیو دێرە بەم جۆرە چاپکراوە :

« ئەیگرتە گاور ســوپای شەپۆلی ڕەنج و ســەدەم »

بەلام لە دەستنوسـەکەدا بەم چەشنەیە کە چاپمان کرد ، ئەمەیان لـە کوردی‌یەکەیدا تازەترە ، بەلام ناچار بوو لە دوو دێری دووا بە دووادا قافیەی ( ستەم ) دووبارە بکاتەوە . - ع -

بپرسە تۆ لە ( حونەین )و ( بەدر )و تۆ لە ( ئوحود )
کاتی بەلاو و موسیبەتتر لە بەلای عیزەم
شیری سپی سوور ئەبوو ، کاتێ بگەییایە مووی
بناگوێی ئەهلی کوفر ، فیدایی ئەو شیرە بم
بە نووکی تێزە ئەیانووسی بە خوێنی لەشیان
بەجێی نەهێشتووە هەرگیز بێ خاڵێك حەرفی قەڵەم
تەواوێتیی تیرو چەك سیمایە بۆ ئیمتیاز
سیمایە شیلانو گوڵ لە یەکتری جیا ئەکەم
ئەگاتە تۆ بۆنی زاڵبوونیان وەها تێئەگەی
گوڵن لە باغا هەموو ئازانو سایت قەدەم
بە پشتی ئەسپیانەوە ، وەك داری بڕوێ لە کێو
دایان نەبەستوون بەلا سوار چاکنو موتەزەم
فڕی ، وا لەرزی دڵی دوشمن لە ترسی ئەوان
جیا نە ئەکرایەوە ئازاو و پووچی خەسم
کەسێ ڕەسوولی خوا بێ ، واسیتەیی نەسرەتی
لە بێشە ئەشکێنێ شێر بە قووەتو بە عەزم
نابینی دۆستی موحەمەد قەت نەبێ نەسرەتی
یا نەپچڕێ دوشمنی دڵ پڕ لە دەردو ئەلەم
وەك شێرێ دانرێ لەگەڵ بێچووی لە پێشە وەها
لە ناو قەڵای میللەتی داناوە ئوممەت بە جەم
گەلێکی ختە زەمین ( قورئان ) لە ئەهلی جەدەل
دەلیلی غالب ئەبوو لەسەر عوومی خەسم
لە حالەتێکی هەتیوی بوو و زەمانی جەهل
لە ئوممیا موعجیزە کیفایەتە بو عەلەم

محمد علی خدر

## پاڕانــەوە

بەم مەدحە خزمەت ئەکـەم داوا ئەکـەم عەفوی بـۆ
گوناهی عومرێ کـە سەرفم کرد لـە شیعرو خەدەم
کـە کردیانـە ملم ئەم دووانـە شــەڕ ، ئاخــری
نیشـــانەیان کردووم ؛ وەك مەڕ بچێ بـۆ حـەرەم
لـە هەر دوو حالا موتیعی مـەیلیو منـــالی بـووم
هیچم نـەنـا پێـکەوە غـەیـری گـونـاهو نـەدەم
کڕیـنو فرۆشــــــتنم زیـانی هێنـــا هــەمووی
هیچ نەیکــڕی دیـن بـە دنیـا نایکڕێ نەفسـەکەم
کەسێ کـە ئەفرۆشێ دینی خۆی بـە دنیـای دەنی
بەیـان کـە بۆ ئـەو زیـان لە جەمعی بەیعو سـەلەم
نـایـدەم لـە دەست عەهدو پەیمانی ڕەسـوولی خوا
هەڵناوەشــــێنم عـەهـد بـا من گونـاهیش بکەم
لـە ســــەریـەتی زیسەتم کـەنـاو نرام مـستەفـا
زۆرتر لـــە هەر کەس وەفادارترە ئەو بۆ زیســـەم
دەســـگیری من گـەر نەبێ لە فەزلەوە ئـاخیرەت
وێـرانـە مـالـم ئەڵێم وا هەڵخلیــــــکا قـەدەم
حاشـا کـە بێبـەش بێ سـائیل لە بەخششی ئەو
یـا بێتـە دووا میـوانی ئـەو نەبووبێ موحتـەرەم
لـەو کاتـەوە بیـری من خـەریکی مـەدحی ئـەوە
من بـۆ نەجـاتـم دەســـم کەوت چاترین مولتەزیم

## پاڕانەوەو
## داوای پێویست

بە بەخششی پیرۆزی دەست کورت دەولەمەند ئەبێ
ئەڕوێنێ باران گوڵان لە شاخی بەرزو عەلەم
من نامەوێ زینەتی دنیا بە وێنەی زوهەیر
دەست پڕ ئەبوو لە بەخشش بە مەدحی بەرزی هەرەم
ئەسبابی خۆشیم نەماوە ( ئەکرەمەلعالەمین )
بێجگە لە تۆ بۆ حەشر یا بۆ دەمی مردنم
کەم نابێ پایەی ڕەسوول ؛ بە من لە بۆ ئینتیقام
کە دەرئەخا ناوی خۆی خوایی خاوەن کەرەم
لە بەخششی تۆوەیە بوونی دنیاو ئاخیرەت
لە علمی تۆیە هەموو زانستی لەوحو قەلەم
مەئیووس مەبە ئەی نەفس گوناهی گەورەت بووە
گەورەو بچووك وەك یەکە نیسبەت بە عەفوو کەرەم
ئەی کاشکی ڕەحمەتی خوا کاتێ کە بەش ئەکرا
بەقەد گوناه و خەتا بهاتبێتە قەسەم
ڕووی وەرمەگێڕە ئومێدم ئەی خوایە لەلات
من هیوای چاکیم هەیە بە تۆ هەتا مردنم
بەم عەبدە لوتفێ بکە لە هەر دوو لا سەبری ئەو
هەرا ئەکا گەر ببینێ ڕەنجو ترسو ئەلەم
ئیزن بفەرموو بە هەوری ڕەحمەتت هەرگیزا
لەسەر نەبی دابکا ، باران بە لێزمەو خوڕەم

هەتا بجوولێ لقی دار بێ بە بادی سەبا
تا ڕێبواران ئەکەن سەدا بە دەنگو نەغەم
ئینجا ڕەزای تۆ لەسەر سدیقو لەسەر عومەر
عوسمانی ساحێب حەیاو و حەیدەری موحتەرەم
هەم ئالو ئەسحابو دوایی تابیعانی ئەوان
ساحێبی تەقواو و پاکی ئەهلی حیلمو کەرەم
یا ڕەب لەبەر مستەفا (ص) کەرەم کە پێویستمان
خۆش بە لە ڕابوردوو ئەی ساحیبی ویسعی کەرەم

## پاڕانەوەی شاعیر

عەفوو کە ئیسلام بە جاهی ئەو ڕەسووڵە کەوا
ئەیخوێنن لە مزگەوتی ئەقساو لە بەیتولحەرەم
بە جاهی ئەو زاتە مالی وا لە تەیەی حەرەم
کە ناوی ئەو سوێندمە ، گەورەترینی قەسەم
تەواو بوو هۆنراوەکەم لە ( دوڕری بوردیە ) جا
حەمدو سەنا بۆ خوا لە سەرەتاو موختەتەم
لە هیجرەتی سێسەدو پەنجاو دوو دوایی هەزار
بە کوردی ئەم تەرجومەم هێنایە ڕیزی نەزم
غەیری شەفاعەت لە تۆ هیچ داواکاریم نیە
لە وەختی مەرگا بە فریام کەوە ئەی موحتەرەم[1]
ئەگەرچی خۆم ناکەم خۆم خستە سایەی کەسێ
ترسی گوناهم نیە بێ بە دەریاو و یەم
بە مەحزی لوتفت خوا بە جاهی ئەو حەزرەتە (ص)
خۆش بە لە خۆمو لە ئەحبابو لە جەمعی کەسم

(1) لە چاپەکەدا ئەم نیو دێڕە بەم جۆرە بوو :
« لە وەختی نەزعا بە ئیمدادم گە ئەی موحتەرەم »
بەڵام لە دەستنووسەکەدا وەك ئەوەی سەرەوەی لێ هاتووە .

ئەمما بینایی دیدە بە چاوانی مستەفا
کوێربم بە چی نەزەر کەمە چاوانی مستەفا
گریان ئەوەندەیە کە نەما ئاوی چاوی چاو
لالە زوبان لە زاری‌یی هیجرانی مستەفا
تۆزێ لە خاکی ئەو دوڕە نووری دیدەمە
یا بۆنەکەی مەدینەیی کەنعانی مستەفا
زاری شەوم بە وێنەیی بولبول لە هیجری گوڵ
شایەد کە بێتە گوێ سەدایە لە ئەلحانی مستەفا
پەروازیە لە بەندی قەفەس بێ سرەوتە ڕۆح
بۆ نیشتنی لە لەنگەری ئەیوانی مستەفا
یا ڕەب بە چاترینی عەرەب من هەمە تەلەب
گەردن کەچی لەبەردەمی دەربانی مستەفا
یا ڕەب بە عەشقی پاکی موحەممەد بە سیڕڕی حەق
یا ڕەب بە سۆزی سینەیی بوریانی مستەفا
ئەو قوببە سەوزەیە کە نووری بەشی هەردوو عالەمە
بێبەش نەبم خوایە لە ئیحسانی مستەفا
داوایی مائیدە مەکە ئەی ئوممەتی مەسیح
وەقتێ کە داخرا لە زەمین خوانی مستەفا
ئەو خوانە پڕ لە فەیزە لە دووریی ڕەسوولەکان
دلشاد ئەبن کە بوونەتە میوانی مستەفا
قانوونی شاعیرانە کە گاهێ بە بەدر ئەکەن
گاهێ بە ڕۆژ ڕوویی درەخشانی مستەفا
با وەرگەڕێ زوبانم ئەگەر مانگە یا خۆ ڕۆژ

تەشـــبیهی کـەم بـە گۆنەیی تـابـانی مســـــتەفا
فەیزی قیـدەم لـە عالـەمی ئیمکان نەکـەونـە دەر
تا شوعلەوەر نەبوو بوو جەوهەری ئیسکانی مستەفا
شـــایستەیی جینـانـە ســـەگی یارەکانی غـار
شـــایستەتر منم ســــەگی یـارانی مســـتەفا
لائیق بـە ســـەبقەتە لـە ئیتاعـەت گونـاهی من
بۆ ڕوتبـەیی شـەفاعەتی سەر شـــانی مســـتەفا
تاریکیی دڵ لـە قەسـوەت ئەگـەر بێ عیلاجی ئـەو
یـەك زەڕڕەیـە لـە شـوعلەیی عیرفـانی مســـتەفا
قوربـانـە عاشـــقان بـە بەسمەلەوە حازرن هەموو
تەنیـا منم کـە نیمە بەســـمەلی قوربانی مســـتەفا
( سـەفوەت ) درۆیـە لافی مەحەبەت لـە خزمەتـا
بێ پـەیـڕەویی موافیقی فـەرمـــانی مســـتەفا

— ٦٦ —

## سەلام ۰۰ ( موناجات )

— ١ —

ســـــەلام لەســـەر تـۆ یـا ڕەســـولەڵلا
ســـــەلام لەســـەر تـۆ یـا حـەبیبـولڵا
ســـــەلام لەســـەر تـۆ یـا نەبیی ڕەحمەت
ســـــەلام لەســـەر تـۆ شـــافیعی ئومەت

سـەلام لەسەر تۆ بەشیرو نەزیر
سـەلام لەسەر تۆ زاهیرو زەهیر
سـەلام لەسەر تۆ ڕەسوول کەریم
تۆی لەسەر خولق‌و ڕەوشتی عەزیم
سـەلامت لەسەر میسباحی زەڵام[1]
ئەی پێغەمبەری خوایی عەللام
سـەلامت لەسەر گەورەی مورسەلین
سـەلامت لەسەر خەتمی نەبیین
سـەلامت لەسەر خاوەن موعجیزات
سـەلامت لەسەر ساحێب کەرامات
سـەلامت لەسەر خاوەن بەراهین
خاوەن دینی ڕاست موعجیزی موبین
شەهادەت ئەدەم گەیاتە ئوممەت
ریسالەتی خوا لەگەڵ ئەمانەت
ئامۆژگاریت کرد یەکسەر بۆ ئوممەت
لاتدا لەسەریان غەم‌و مەشەققەت
غەزاتکرد لە ڕێی ڕەببولعالەمین
خوا پەرستیت‌کرد هەتا هات یەقین
سـەلامت لەسەر خاوەنی ئەنوار
سـەلامت لەسەر ساحێبی مەنار
لە نوورت مانگ‌و ڕۆژ بوون پڕ لە نوور
لە نوورت عەرش‌و لەوح کردی زهوور

(١) زەڵام : ظلام : تاریکی .

## — ٢ —

ئەسـەلام ئەی هاتـە دەنگ بۆت بەردو دار
ئەسـەلام ئەی نووری عەرشـی کردگـار
ئەسـەلام ئەی زینـەتی مولـکی خـوا
ئەسەلام ئەی سەروەرو ئەی پێشـەوا
ئەسـەلام ئەی خـاوەنـی عیلمـولیـەقین
ئەسەلام ئەی کێـوی عیـلمو حیـلمو دیـن
خـاوەنی ئـالآیی مەحشـەر ئەسـەلام
حـەوزی کـەوسـەر تایەتیتە ئەسـەلام
ئەسـەلام پێغـەمبـەری ڕەحمەت ئـەتـۆی
ئەسـەلام ئـەی شـافیعی ئوممەت ئـەتۆی
ئەسـەلام ئـەی تـۆ بەشـیرو تـۆ نـەزیـر
ئەسەلام ئـەی زاهیـرو ئـەی تـۆ زەهیر
ئەسەلام ئـەی سـاحێبی خولقی عەزیم
ئەسـەلام ئـەی خـاوەنی لـوتفی عـەمیـم
ئەسـەلام ئـەی نـووری تـاریـکی و زەلآم
ئەسـەلام ئـەی ڕەحمەتی بۆ گشـت ئـەنـام
ئەسـەلام ئـەی سـەییدی بۆ مورسـەلین
ئەسـەلام پشـتو پـەنـاهی موئمینین

# پاڕانەوە

ئەی زائیری ڕەسوولی خودا نووری چاوەکەم
ڕەحمێ بکە بە جەرگ‌و دلی بێ هەناوەکەم
وەقتێ کە چووی گەیشتیە ئەو ئاستانەیە
تەبلیغی کە دیاریی سەلات‌و سلاوەکەم
مل کەچ بکە لە باتیی من‌و عەرزەکەم بلێ
ڕووم نایە من کە بێمە ڕوو ، ڕوو تکاوەکەم
بەحری دلم لە جۆشە بە خوا لە ڕۆژی ڕووت
ئاهم بووە بە هەوری بە توندو بە تاوەکەم
وەختێ کە لێی ئەدا هەوایی مەحەببەت بە وەشتەوە
جا دائەکا بە خوڕ ، ئەتەقێ هەردوو چاوەکەم
دێ‌و ئاو ئەدا بە گولشەنی گولزاری عەشقی من
دابنیشم ، دێ بە یادێوە بۆنی گولاوەکەم
وەختێ کە سەر ئەنێمەوە بۆی سنگی خۆم ئەکەم
بێتاب ئەبم لە بۆنی کەبابی سوتاوەکەم
چاوم ئەوەندە بڕیە مەدینە بە گریەوە
لێلابی هاتووە بە دوو چاوی خوێن تێزاوەکەم
دڵ وا لە تەیەوو بەدەنم لێرە موبتەلا
بۆچی منم کە تۆلمە .... چاوەکەم[1] ..
بە کۆیی موبارەکت ئەبێ جومعە ڕۆژو شەو
سەلەواتی خۆت وەعدی شەفاعەت دراوەکەم
ڕۆژێ کە ئەنبیا هەموو سەرسام‌و عاجزن

(١) ئەم نیوە بەیتە ناتەواوە .

ئەی ســـــاحێبی لیوایی حەمد هەڵکراوەکەم
تۆی واســـــیتەی نەجاتی دڵی هەروەکو نەبی
ئەی ڕوتبەیی شـەفاعەت پێبەخشـــراوەکەم
ئیحساسی خۆم بە زاهیرو باتین بە تۆوە بەســت
تا شـــێتە شـــێتە کەوتنە دووم بوو بە ناوەکەم
هێند بەردی تەعنیـان بەسەرمدا دا ، شکاوە سەر
سا مەرحەمەت کە مەرهەمێ بۆ سەرە شکاوەکەم
تەشبیهی ڕووت بە مانگ‌و بە ڕۆژ سەهوی تێئەگەم
ئەی نووری مانگ‌و ڕۆژ لە ڕووت وەرگیراوەکەم
لەو جێیەدا کـە پێی‌نەگەیی کەس لە ئەنبیا
تۆ بوویتـە شـاهی تـاج لەسەر سەر نراوەکەم

## — ٦٨ —

### بۆ پێغەمبەر[1] ...

بە جـەژنی مـەولیـدی زاتێ ئـەنـازم
لـــە ســایەی لوتفی ئـەودا ســەرفەرازم
نـە وەك ئـەو لوتفـە تەنیـا بـۆ مـنو بەس
نیـگاهێـکی نـەجـاتـە بـو هەمـوو کـەس
ڕەســـوولێ هاتـە ڕوو ، ڕۆژێ بوو عـالـەم

(1) ئەم قەســـیدەیە لە ڕۆژی ١٢ی ( ربیع الاول )ی ساڵی ١٣٧٧ = ١٩٥٧/١٠/٧دا لـە مزگەوتی گـەورە لـــە مەولوودی ئـەوقـانـا خوێنراوەتەوە .

بـه جـاریّ نوقمی دەریـای جەهـل‌و مـاتەم
چ زاتیّ ؟ ڕۆژی عیــرفـان نووری یـەزدان
ســـەناخوانی ئـەوە ئـایـاتی قـورئـــان
زەمین پـڕ شــیرك‌و کوفرو بت‌پەرســـتی
دەمـــارو دەعیـەوو کین ، خوویی پەســـتی
هەموو جـەردەو دڕنـدەو جانـەوەر بـوون
لـــە مـەردیو پیـاوەتیـــدا بیّ هونەر بوون
بـــە تـەنیـــا ڕاپـــەڕی ئـەو میهرەبـــانـە
بـە هیّـزی ئیّـزەدی لـــەم ڕووی جیهـــانە
لـەگـــەڵ ئـەهلی حیجـازی پـــاك بونیـــاد
بـە قـورئـــانو حەدیـــسی کەوتـە ئیرشـاد
لـەگـەڵ پاکـان بـە نووری وەعزی قورئـان
لـەگـەڵ ســەرکەش بە مەودای تیغی بوڕران
هەتـاکـو خەلقی خـــــە ســـــەر حەقیقەت
دروســـــتی کرد لـە جەردە قـەومو ئوممەت
وولآنی کــــردە چی ؟ کــردبـە حیجـــازیّ
هــەتـا مەحشـــەر کە ئیـــان پیّی بنـــازیّ
لـەجیّی شــیرك‌و کوفـر ، پڕ بوو لـە ئیمان
لەجیّی حەهـل‌و نـەزانی ، عیـلم‌و عیرفـــان
لەجیّی زۆرو درۆ عـــــەدل‌و مـەحەبـــەت
لـە جیّگەی بوغـزو کین دانیشـت صەداقەت
هەتـا ئیـــلام گەیشـــتە ئەوجی ئـەفـلاك
بــــە هیّـــزو هیـەتی ســـولتانی لـەولاك
( موحەمـەد ) شـــاگولی گولزاری وەحدەت

( موحەمەد ) سەروی بوستانی مەحەبەت
لە سایەی ئەهلی کوفرا بووی ، نەجاتی
بە حالی ئومەتی خۆت ئیلتیفاتی
بیارێنە خووا بارانی ڕەحمەت
لەسەر خۆیو سەحابەو ئالو ئومەت

## ٦٩

خوایا بە زاتو سیفاتی قەدیم
بە ئایاتی قورئانی گەورەو عەزیم
بە نەزدیکیی دەرگانەیی عیزەتت
بە پەردەنشینانی بەر قودرەتت
بە زیکرو بە تەسبیحی بالآنشین
بە هەر چوار موقەڕڕەب خوسووسەن ئەمین
بە دەفتەر بەدەستانی دیوانی پاك
بە سیڕڕی دلی عاشقی دڵ ڕوناك
بە ئەسرینی ئادەم دەمێ هاتە دەشت
لە دووریی ویسالو لە هەجری بەهەشت
بە تەقوایی شیتو بە گریانی نووح
بە سەرمەستی بادەی بەیانی سەبووح
بە یەعقووبو حوزنی لە بەیتولحەزەن
بە ئەیووبو سەبری لە گۆشەی میحەن
بە سۆزی زەکەریا بە دانەی مشار

کە دوونیم کرا پێ لەناو جەرگی دار
بە بۆنی گولستانی ناری خەلیل
بە مێشی غروورت کە پێ کرد زەلیل
بە گەردنکەچی تیغی ئەمری زەبیح
بە مووسایی عیمران بە زوهدی مەسیح
بە نووری تەجەللایی یەزدانی پاك
لە سیرڕی دلی شاهی لەولاکە لاك
بە سەردارو خەتمی هەموو نورسەلان
بە نازو نیازی هەموو دولبەران
بە تەنیا سواری شەوی لامەکان
بە پشتو پەنایی هەموو موزنیبان
بە ساحێب شەفاعەت لە یەومولحەزین[1]
بە شاهنشەهی تەختی عیززەتنشین
موحەممەد شەهنشاهو گەورەی ئەنام
خوایا قبوول فەرمو سا لێم مەرام
چ ئاسوودە بووم من لە کونجی عەدەم
لە بێدینیی دوور لە دەردو ئەلەم
لە ناکاوی نەمزانی کردم زهوور
لە ئیسیراحەتی خۆمی کردم بە دوور
ئەبێ چی بێ حیکمەت لە ئیجادی من
سەراپا هەموو نەقسە بنیادی من

(۱) مەبەست ڕۆژی قیامەتە .

بە خۆم بێ عەدەم چابوو بۆ نوێنو جێم
کەسێ نەیئەزانی کە من چیمو کێم
کە هاتوومە دنیاوە بێ ئیختیار
عەزابم مەدە تو خوا کردگار
تکێ ئاوە ئەسڵم لە سەر ڕوویی خاك
ئەبێ چۆن بمێنم بە سافی‌و پاك
بەڵێ لێڵ ئەبم ، ئەبمە قوڕ پیس ئەبم
بە کامو بە مەقسوودی ئیبلیس ئەبم
سەراپا گوناهم ، سەراپا خەتام
نیە چارەو و مەلجەئم ئەی خودام
پەناهم ئەوا برد خوا بۆ ڕەسوول
بە ئەدنایی ئوممەت کە بمکا قبوول
بە مەجبووری ئالامە ئەسحابەوە
بە مەحبووبی خۆت و بە ئەربابەوە
بەڵێ لایقم بۆ عەزابو عیقاب
نیە کردەوەم تا ببینم سەواب
جەسارەت ئەکەم من بە ( لا تەقنەتوو )[2]
کە پاڕانەوەم جێ گرێ زوو بە زوو
بە ئومێدی تێکەڵ بە حوببی ئەوان
بە ڕوویی فەخری عالەم ببم شادمان

(٢) لا تقنطوا من رحمة الله ..

—— ٧٠ ——

لەسەر بەرگی کتێبی « رسائل فلسفیە »ی ئەبووبەکری ڕازی نووسیویە :

گەلێ کەس توبیی[1] ڕۆحانیی هەیە ، لاکین نەوەك ڕازی
ئەدیبو شاعیران زۆرن ، بەلاّ ناگەن بە شیرازی
یەکێ گولنازە ، یەك شانازە ، یەکتر پێیئەلێن شیرین
چقلّ یەك ، یەك گەدا ، یەك تالّ ، بەرەو ڕووی چاوی پڕ نازی

(١) توبیی : طبّ .

●

## بە عەرەبی

—— ٧١ ——

لەسەر بەرگی کتێبێك نووسیویە : لە لاسایی باسی سێوی « مستظرف »دا ..

| | |
|---|---|
| تفاحةٌ كميت لونين صفحتها | كالعاشقين اذا خداهما أتصلا |
| فأبصرا عاذلاً يرميهما نظرا | فأصفر ذا وجلاً وأحمر ذا وجلا |

لكاتبه صفوت

●

—— ٧٢ ——

لەسەر بەرگی کتێبی ( الطب النبوی )ی ابن قیم الجوزیة شمس الدین محمد بن أبی بکر نووسیویە :

| | |
|---|---|
| كتاب فيه كنز غير مكنون | لشمس الدين أجر غير ممنون |

( لصفوة )

## ٧٣

له پارچه کاغەزێکدا نووسیویه : ( بۆ هاتنی ئەمین زەکی بەگ ) ..

ورد البشـــير فكان أكرم وارد فملا القلوب مســـرة وسرورا

١٩٣٥/٣/٦

لەسەر بەرگی ( فصـــوص الحكم )ی ابن عربی بـــه خـــەتی خۆی نووسیویه[1] :

يحن الحبيـــــب الى راويـة واني اليـه أشـــــــدُّ حنينـا
وتهفو النفوس ويـأبى القضــاء فأشــكو الانين ويشــكو الأنينا

---

(١) ( دڵنیا نیم ئەمیان شیعری خۆیەتی یانا ) .

●

## ٧٤

لەسەر بەرگی کتێبی « الوحي المحمدي »ی شێخ محەمەد ڕەشید ڕەزا ئەم دێڕە فارسی‌یەی نووسیوە :

بـه کـام بلبـل شـيدا شـكوفه باش اى گل
دريـن دو روزه كـــه بـر طرف انجمن باشى

صفوت

●

٧٦

بێ پـاره بوو سـوفلی بوو ، پـارەی بوو قـەڵا دەرچوو
بێ پاره بوو جاهیل بوو ، پـارەی بوو مـەلا دەرچوو
گـەر تـۆ نەبی ئـەی پـاره ، بێ قیمەتـەکـەی پـاره[1]
لـەم کوونیـە بـازاڕە ئیمڕۆکـە تـەڵا دەرچـوو

(١) پاره بە مانا پوول‌و بە مانا پارچەیە .







٦٦

لەسەر بەرگی چاپێکی «المنجد» کە لە حوزەیرانی 1943 دا لە کتێبخانەی «صادر»، لە بێرووت کرێبووی ئەم چەند دێڕە نووسرا بوو :

ئاخۆ شاد ئەبم بە نیشتمانم
چاوم ڕوون ئەبێ بە ڕووی خزمانم
ئەو دوو برایەی دوور قوڵە میرم
بە ڕۆژو بەشەو کەوان لە بیرم
لای تۆ ئاسانە ، بە خوا خووایە
شادم کەی بە ڕووی ، ئەو دوو برایە
بگرمە باوەش عیزەتی دینم
یانی عیزەدین کۆرپەی شیرینم
چایەك لێ بنێم لە بن دارە ڕەش(1)
ماچ بکەم گۆنای فارووقی چاوگەش
«ئاخ دووریی نیشتمان ...!»

(1) مەبەس دارە ڕەشکەی باخچەی مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسوولە ، کە لە دوویا دگارەکەی مامۆستا عەلائەدین سوجادیو مامۆستا سەعید ناکامدا باس کراوە . ئەو مزگەوتەی کە تێکد را .

دوو ووشه
بۆ یادگار

________ :: مامۆستا ـ عەلائەددین سەججادی
________ :: مامۆستا ـ سەعید ناکام

## به یادی

## سالی ١٩٣٤ەوە !

گۆرران وا دیارە وەکوو روو لە بیرو باوەر ئەکـاتـەوە ، روو لـە جۆری کۆمەڵایەتی ئەکاتەوە . بەو جۆرەش روو لە کۆشـکو خانوو و ئاوەدانیش ئەکاتەوە . ئەم روو کردنەوە زاهیرەیەکی کۆمەڵایەتی‌یە .

لە سولەیمانی لە جادەی بەر کورتاندرووکانا ، بە بەر ئەسـحابـە سپی‌دا ؛ راست ئەرۆیشتیت تووشی مزگەوتێک ئەبوویت بە ناوی مزگەوتی باشچاوش ؛ وە یا بە ناوی مزگەوتی حاجی مەلا رەسولەوە ، کـۆڵانی لای ڕاستی مزگەوتەکە سەرەوخوار ئەبووەوە بۆ دەشتی ئەحمەدی عیسآغاو بـۆ لای مالی حاجی مەلا محیی‌دین ، لای چەپی ئەبوو بە دوو بەشـەوە ، بەشێکی ئەچوو بۆ کاریزی دایکی پاشاو لای مالی عەزمی بەگ ، بەشێکی

ئەچوو بۆ سەر چیەن . پشتەوەشی مالی عارفـاغـاو حـاجی قـادر بوو . مزگەوتەکە حەوشەیەکی هەبوو . سەکۆی نوێژی ئێوارانی هاوینان لـــە ناوەراستی حەوشەکەدا بوو ، روو بە قیبلە بە هەیوانو ژووری مزگەوتو ژووری مەلاو حوجرەی فەقییان بوو . بەلای راستەوە حەوزی وسلخانەو ریزە ئاو دەستێک بوو ، دوو دارە رەش لە حەوشـــــەکەدا بوو منـالان گۆرانییان پیـا ئەوت : لـــە ســـــالی ١٩٦١دا ئەو مزگەوتـە هەلگیراو شوێنەکەی بووە بەو گۆررە پانە کە ئێـــــــتە هەیە . ئیتر نازانم رۆژانی داهاتووی‌تر ئەیکا بە چی ؟!

مامۆستا ، وە یا مەلای ئەو مزگەوتە مامۆســــتا مەلا مســـــتەفای « صفوة »و کوری حاجی مەلا رەسوولی دێلێژەیی بوو . مەلا مــــــتەفـا زیاد لە مەلایەتیەکەی بیرێکی نەتەوایەتیو زمان پەروەریی کوردیی هەبوو .

ئەم « من »ەو مەلا محەمەدی تەوێلەییو مەلا حەسەنی شاتری لـە خزمەتی ئەوا ئەمانخوێند . چەکامەکەی « بوصیری » کـە بـە قصــیدەی بوردە بەناوبانگە هۆنراو بە هۆنراو کردبووی بە کوردی لە کۆری دانیشـــتنی شەوانا بە سوزێکەوە ئەخوێنرایەوە ، هەر لەو سالانەدا کەوتە سەر ئەوە کە چاپی بکا ، هاتوچۆی چاپخانەی شارەوانی ئەکرد بۆ لە چاپدانی . هــەر جارە منیشی لەگەل خۆی ئەبرد .

ئەوەی زۆر سەرەنجی رائەکێشــــــام ئەوە بوو کـــە گەلێ جـــار دەستەیەک ئەهاتن بە شەو لە ژوورەکەی خۆیا دائەنیشـــتن دەرگاکەیـان دائەخست نەیانئەهێشت کەس بچێتە لایان ، رێگای منیشیان هــەر نەئـەدا بەلام ئەوەندەم هەست ئەکرد کە شتێکی نهێنییان هەیە . دەســــتەکەش برێتی بوون لە :

مەلا حەسەنی مەلا قادری بیارە کە ئەو سەردەمە قازیی چوارتا بوو ، ◀

فایق بێ‌کەس ، مەحموودی فەقێ محەمەدی هەمدوەند . میرزا مارف‌و نەجمەدینی برای خۆی . ئەمانە زۆر بە پارێزەوە ئەهاتن‌و کۆبوونەوەکەشیان هەر بە شەو و زۆر نهێنی بوو . لە پاش ماوەیەک بۆم دەرکەوت کە ئەمانە قسە لە کوردایەتی‌یەوە ئەکەن‌و ئەیانەوێ پارتێک دروستبکەن بەلام شتەکەیان زۆر بە نهێنی گرتبوو ، چونکە لە دژی مێرنی ئەو سەردەمە بوو ، وە بۆ کوردایەتی بوو . ئەوەی کە من زۆر بەلامەوە سەیر بوو لەو سەردەمەدا ئەوە بوو کە : فایق بێ‌کەس هەر جارە ئەچوو بۆ سەر پێشاو ، بە پێوە میزەکەی ئەکرد ، ئەمە بۆ ئەو رۆژە کفر بوو . ئەموت مامۆستا تۆ چۆن رێگای پیاوی فەرمەسۆنی وا ئەدەی کە بێتە مزگەوتەوە ؟ ئەویش گالتەی بە قسەکەم ئەهات‌و دەستی ئەکرد بە پێکەنین ، بە ماوەیەکی زۆر لە دوای ئەو مێژووە تێ‌گەیشتم کە مەعنای پێکەنینەکەی ئەوە بوو ئەیوت : « ئاش لە خەیالێک‌و ئاشەوان لە خەیالێک » .

لە کۆتایی ئەم قسەما ئەڵێم : درووود بۆ رەوانی پاکت مامۆستا صفوة . تۆ بوویت لەو رۆژەدا کە هەندێ تۆی کوردیاتی لە باری سیاسی‌یەوە لە ناو بەرەی مەلاکانی ئەو رۆژەدا بچێنیت ، کە دوا جار زۆریان لەو بەرهەمە بەهرەدار بوون ، وەکوو شا کارەکەت گۆررانی « قصیدەی بوردە » بە کوردی گیاتێکی‌تری خستە ناو کۆڕی رابواردنی مزگەوتەکانی سولەیمانی‌یەوە .

علاء الدین سجادی
١٩٨٣/٦/٨

برای بەڕێز دوکتۆر عیزەدین مستەفا پێی ڕاگەیاندم کـە نیازی هەیە هەندێ لە نوسـینەکانی باوکی چاپبکاو لـەبـەر ئەوەی ئاگاداری چمکێ لە پەیوەندی دۆستایەتی منو ئـەوە ، حەز دەکا چەند دێڕێکی لەسەر بنووسم .

منیش بۆ ئەوەی بزانم بابەتەکانی ئامادەی چاپ چینو لە چ پلەیێکی ئەدەبیدا جێیان دەبێتەوە ، ئەم وشـەیە لـە ڕوانگەی خۆمـەوە تـەنیـا بـە مەبەسـتی بیرەوەریو ناسـاندنی مامۆسـتا سـەفوەت بەوانەی نایناسـن یـا بـە هەڵە ناسیویانە تۆمار دەکەم .

ـ ناکام ـ

## مامۆستاو هاوڕێی کۆچکردوم
## مستەفا سەفوەت

ساڵی ١٩٣٣ پیرەمێردی نەمر چاپخانە شـەقوشڕەکەی بەلەدیەی سلێمانیی بە مەبەستی دەرهێنانی ڕۆژنامەی ( ژیـان ) بەکرێ گرت ، مـن یەکێك بووم لەوانەی شانازیی بەشداز بوونی ئەم کارەکە پیرۆزەم پێ براو توانیمان ئـەو مەکینـە شکاوەی یـادگاری زەمـانی دەسـەڵاتداریی مێجەڕسۆن بوو . بخەینەوە گەڕو دەزگا پیتەکانی دەسکردی عوسـمانی ◀

بەهاری سالی ١٩٣٧ ئاگادار کرام کە میری سوسـەی هەندێ لـە هەلسوڕانەکانمیان کردوەو لەوانەیە بگیرێم ، بۆیە باشتر وایە بۆ ماوەیێك خۆم بزر کەمو لەبەر چاوان نەمێنم • بۆ ئەم مەبەستەش حوجرەی فەقێکانی مزگەوتی حاجی مەلا رەسوولی لە گەڕەکی سەرکارێز رەچاو کراوە[٣] •

شەو چومە مالی مامۆستا مەلا مستەفاو لەوێ دەستێ جلی شڕو پینە کراویان بۆ هێنام لەبەرم کردو کـاتێ بۆ نوێژی خەوتـنـان چـو بـۆ مزگـەوت[٤] ، منیش بە زمیلەیێکەوە دوی کەوتم ، لە مزگەوت بردمیـە حوجرەو بە ناوی فەقێ عەبدوللا ( سوختە )یێکی شارباژێری بە فەقێکانی ناساندم •

ئەو کاتە مامۆستا عەلائەدین سجادی یەکێك لەو ( موستەعید )انە بو کە لە خزمەت مامۆستا مەلا مستەفادا دەرسی دەخوێند • شەش رۆژ بەو جۆرە مامەوە تا پێیان ڕاگەیاندم کە ئەو مەترسی‌یەی بو بەسـەرچوەو دەتوانم بێمە دەرەوە • جا ئـەم پەیوەندی‌یەی نێوان منو مامۆسـتا ساردنەبوەوەو رێزی من بۆی هەتا رۆژی کۆچکردنی وەکو خۆی مایەوە •

لە سالەکانی پاشی پەنجادا ، باری سیاسی‌ی عیراق وەکو کەلەکی سەر ئاو سەروخواری دەکرد ، چەند دەستەو رێبازی سیاسی لەناو کوردا پەیدا بوبون کە هیچیان ددانیان پە یەکتردا نەدەنـاو جگە لـە خۆیـان هـەمو ◀

[٣] داخی ئەودەم لە دڵ دەر ناچێ کە دەبینم ئەو مزگەوتە بـە خۆیو روداوە ترشو شیرینەکانی ئێمەمانانەوەو دارچنارە کۆنە سـالەکەی کە ملکی جوتێ لەقلەقی ئێـك سوکبور و هەمو سـالی جوجەلەکانیان لەنـاو لقەکانیا پێدەگەیاند ، تەختکراوەو شوێنەواری نەماوە .

[٤] مالی مامۆستا تەنیا سی چل مەترێك لە هەورازی مزگەوتەکەبەوە بو .

بژاره بکەین ، پاش رەنجو تەقەلایێکی زۆر ، نەك رۆژنامە خنجیلانەکەی ژیانمان خستە بەردەستی خوێنەرە تامەزرۆکانی وشەی کوردی ؛ بەڵکو بەدەمیەوە وردە کتێبو نامیلکەشمان بە چاپ گەیاند[1] .

بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەیێکی هەفتانەی کوردی بە چوار لاپەڕەی بچوکو ناوەرۆکی هەمە چەشنە ، وەك نمەبارانی بەهار چیمەنی هەستی نەتەوایەتیی لە سلێمانیدا گەشە پێکرد ، پیرەمێرد رابەری ئەم دەورە بەرزەبو ، بەلاّم ئێمە ـ ئیشکەرانی چاپخانە ـ ش بێبەش نەبوین ، لەگەڵ چەند رۆشنبیرێکی کوردا بوینە ئاشناو پەیوەندی برادەریمان بەستبو . یەك لەوانە مامۆستا سەفوەت بو .

ناسیاویو دوستایەتیم لەگەڵ مامۆستای رەحمەتیدا ئەو رۆژانە چەکەرەی کردو تا هات پتر بنجی داکوتا ، بە تایبەتی پاش ئەوەی بۆم دەرکەوت کە لەگەڵ مامۆستا لە رێبازی کوردایەتیشدا هاورێینو سەر بە یەك پرۆگرامین[2] .

---

(1) رۆژی رۆژنامەگەری کوردی ۲،۲/٤/۱۹۷۸ لە بارەگای یەکێتی نوسەرانی کورد لقی سلێمانیدا وتارێکم خوێندەوە بە ناوی « بیرەوەرییەکانی چل ساڵەم لەگەڵ رۆژنامە کوردییەکاندا »و بە درێژی باسی گۆواری ( زاری کرمانجی )و رۆژنامەی ( ژیان ـ ژین )و رۆژنامەی ( کوردستان )ی مەهابادو چاپەمەنییە نهێنییەکانو ( برایەتی )و گۆواری ( رۆژی کوردستان )م کرد . بەلاّم ئەو گوتارە بە جۆرێك پەردەی شارانەوەی پێدادرا کەتەنانەت هەواڵەکەشی نەگەیشتە چاپەمەنییەکان .

(2) لەو ساڵانەدا کۆمەڵەیێکی نهێنی لە ناوچەی سلێمانی پێکهاتبو بە ناوی ( برایەتی )و پاشتر بو بە ( یەکێتیو برایەتی ) ، ئەم کۆمەڵە پاش تەنیبژوە و پەلوپۆی هاویشتبو ، لەوانە بو ئەگەر شەڕی دوەمی جیهانی بەسەردا نەهاتبایە گەلێ کردەوەی دیار و گەورەی نەتەوەیی تۆمار بکا . سەیر ئەوەیە تا ئێستا بەرچاوم نەکەوتوە شتێکی لەسەر نوسرابێ یا یادێکی کرابێتەوە .

لایێکیان بە گومڕاو شیاوی نەمان دەزانی . منیش کەوتبومە کۆمەڵێکەوە کە تەواو ئاوەژوی ڕەوت‌و ویستی مامۆستا بو . بەڵام ئەم دوبەرەکی ڕێبازەمان ئەوەندەی تۆزقاڵێ ڕێزو خۆشەویستی ئەوی لە دڵی مندا کەم نەدەکردەوەو بە هەمان چاوی هاوڕێ‌و مامۆستای جارانم سەیر دەکرد ، ئەمەش تەنیا بە هۆی عاتیفەی خۆم‌و ئەمەکی کۆنەوە نەبو ؛ چونکو هەندێ دۆستی خۆشەویست‌و برادەری لە مێژینەم هەبون کاتێ بۆم دەرکەوت لە سەنگەری بەرامبەرمدا دەجەنگن ڕاستو چەپێکم بەسەر لاپەڕەی دوستایەتی کۆندا هێنا ؛ بە گژیاندا چوم‌و چیم لە دەست هات درێغیم لێ نەکردن . بەڵام دڵنیایم لە دڵسۆزی ڕاستەقینەی مامۆستا بۆ کوردایەتی - بە شێوە تایبەتی‌یەکەی خۆی - شوێنێکی تایبەتی لە دڵی مندا کردبۆوە کە تێک نەدەچو .

مامۆستا مەلا مستەفا سەفوەت پیاوێکی بە وەفاو هەواڵ‌ویست‌و هاوڕێ پارێز بو ؛ شان بە شانی ئەو ڕێبازە ئایینی‌یەی پشتاو پشت بۆی هاتبوە خوارێ‌و پڕ بە دڵ باوەڕی پێی بو . کوردێکی دڵسۆزو نەتەوە دۆستیش بو ، لەو ڕۆژانەدا کە نرخی مرۆی کورد بە سەنگی نزیک‌و دوری لە حزبایەتی هەڵدەکێشراو گەلێک پەڵەی ڕەوشتی چەوت‌و ڕابوردوی چڵکن بە ئاوی بژێ‌و بڕوخێ دەشۆرایەوە ، ئەو بەوپەڕی پڕکێشی‌یەوە پارێزگاری لە باوەڕە کلاسیکی‌یەکەی‌و ئەو جۆرە کوردایەتی‌یە دەکرد کە خۆی بە ڕاستی دەزانی‌و لەسەر ئەمە توشی نارەحەتی‌و بەندوباوی ناڕەوا هات‌و کۆڵی نەدا .

سڵاوی گەرمم لە گیانی پاکی مامۆستاو هاوڕێی یەکەمین شەقاوی ڕێگای تێکۆشانی کوردایەتیم مامۆستا مەلا مستەفای حاجی مەلا ڕەسوڵ ، ئەو کەسەی من لە کەسەکانی خۆی‌و لە نەیارەکانیشی باشترم دەناسی ... ئەم چەند دێڕەی وەکو قەرزی وەفاو هەق‌بێژی پێشکێش دەکەم .

## مەولوودی پێغەمبەر

ئێنجـا مەلا مستـەفـا سەفوەت و شێخ ئەبوبەکر ئەفــەنــدیی مامـۆستـا سەروخوتبـەیـان دا ،زۆر بەتەئسیرو رێك و عالمانەو عالەمیانە .
دیـارە ئەم تەئسیـرە جگە لە مەهارەتی خەتیبی و نوبـزەی شاعیری بەرەکەت وموبارەکی‌ی ئەو رۆحە پاکەی پێغەمبەرە .
ژین . 903 ، 29ی کانوونی دووەمی 1984 .

### حەمیەتی دینی

. . . . دووایی مەلا مستــەفــا ئەفــەنـدیی حاجی مەلا رەســوولیش دوورودرێـژ لە قودسیـەتی بەیتولموقە دەس و ئەهەمیەتی ئیجابی حەمیەت وفتووەتی ئیسلامیەت دووا . . .

ژین . ژ 919
20ی ئەیاری 1984

## جەژنی مەولوود

. . . مەلا مستەفا ئەفەندیی مودە ڕیسیش عەینی نەعت و دروودی بەزەمزەمەییکەوە ئینشاد کرد . . .

ژین . ژ 951

20ی کانوونی دووەمی 1949

. . . ئنجا مەلا مستەفای مودەریس ، نەوەی حاجی مەلا رەسوول موشەیەدەیەکی زۆر بڵندو پەسندی خوێندەوە . لەگەڵ ئەمەیشدا خۆیشی عەینی مەولوودێکی تازەی تەئلیف کردووە ، خواو پێغەمبەریار بن ، ئەویش ئەخوێنینەوە .

ژیان ژ 484 . س 11 .

20ی حوزەیرانی 1936 .



## پێرست

بەشی ئاینی .

الجمهورية العراقية
وزارة الثقافة والاعلام
دار الثقافة والنشر الكردية
السلسلة رقم ([illegible])

# ديوان صفوت

ديوان الشاعر
مصطفى صفوت الحاج ملا رسول
ديليژه

تحقيق واعداد وتقديم
الدكتور
عزالدين مصطفى رسول
(استاذ)

نرخی 800 فلس

تصميم الغلاف عبدالقادر علي مردان
دار الحرية للطباعة ـ بغداد